


موسی بن ڕاشد العازمی

# دیاری

## بۆ ناسینی پێغەمبەری نورانی ﷺ



وەرگێڕانی

هۆشیار نصرالدین کەلاری








دیاری بۆ ناسینی پێغەمبەری نوورانی ﷺ

نووسینی: موسی ابن راشد العازمی

وەرگێڕانی: هۆشیار نصرالدین کەلاری

پێداچوونەوەی: بێستون ژاڵەیی

نەخشاندنی نوسین و بەرگ: کتێبخانەی گەشە

چاپکردن: کتێبخانەی گەشە

نۆبەی چاپ: دووەم، ٢٠٢١

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: دینار

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان، ژمارە سپاردنی (١٦٦٧)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە.

کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ‌و بڵاو کردنەوە 

سلێمانی – بازاڕی ئاوباریک بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١

 ٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ – ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ

فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾

(ال عمران: ٣١).



بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله

## یەک دوو وشە لەجیاتی پێشەکی:

بەوردی و وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕ لەسەر ناوەرۆکی ئەم نامیلکە جوان و بۆنخۆشەی سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستام. کە نووسەری کوەیتی پسپۆڕ لە سیرە موسا بن راشد العازمي نووسیویەتی و برا و هاوڕێم مامۆستا هۆشیار کەلاری بۆ کوردی وەری گێڕاوە.

ئەڵبەتە سیرە لە زاراوەدا واتە: هەموو ئەوەی لە ژیاننامەی پێغەمبەری پێشەواوە ﷺ گەیشتووە وگواستراوەتەوە. لە لەدایکبوونیەوە و لەپاش وپێش ناردنیەوە بە پێغەمبەر ﷺ و هەموو ڕووداو وماجەراکانی ناو ژیانی تا کۆچی دوایی ئەم پێشەوا و مرۆڤە بێ وێنەیەی سەرزەوی ومێژوو. کە ئەمەش هەموو ئەمانە دەگرێتەوە: لەدایکبوون و بنەچە و شوێنی ژیان وبنەماڵە وعێل وعەشیرەت و منداڵی وگەنجێتی و ماجەراکانی ناردنی بە پێغەمبەر ﷺ و دابەزینی نیگا وسروشی خوایی بۆی. تا ڕەوشت وشێوازی ژیان و موعجیزەکانی و قۆناغەکانی بانگەواز لە مەکە و مەدینە. هەروەك سیرە لای زانایانی فەرمووده بەمانای سوننەش دێ. بەواتای ئەوەی ئەدرێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ لە گوفتار وکردار و پەسەندکردن و سیفەتێك. لای زانایانی عەقیدە وبنەماکانیش ماناکەی ڕێبازی



پێغەمبەر ﷺ وهیدایەتەکەشی دەگرێتەوە. بۆ زانایانی مێژووش دەکاتە هەموو هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ وغەزاکانی، ئەوەش گرنگە ئاماژەی پێ بکرێ کە سیرە سیاقی زەمانی ومەکانی و گرنگی وتایبەتمەندی و خەسڵەت و سەرچاوەگەلی تایبەت بەخۆی هەیە و لەهەر دەرگا وپەنجەرە ولق وپۆپێکیدا بە سەدان سەرچاوە و بابەت وباس وتوێژینەوە هەیە .

بێگومان نووسەر و سیرەنووسە موسوڵمانەکان سەدان کتێبیان دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەری پێشەوای مرۆڤایەتی ﷺ نووسیوە. کە هەر یەکە وتام وبۆ و ڕەنگ و ڕواڵەتی خۆیان هەیە. بەڵام ئەم جریوە خۆشانەی ئەم بولبولە خۆشخوانەی سیرە کە پێشتر لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر بڵاوی کردۆتەوە. لەپاڵ ئەوەدا کە پڕە لە زانیاری دروست وپشتڕاست کراوە لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیزﷺ.

هەروەها بە شێوازێکی سەرنجراکێش داڕێژراوە و زنجیرەبەندیش کراوە. هەروەك لەبەر ئەوەش کە ئەم پیاوە لەم بوارەدا پسپۆڕە زۆر مەنهەجی و زانستیانەش ڕوداوەکان ڕیز دەکات و دەگێڕێتەوە و گرنگی زۆریشی بە سەنەدی زانستی وباوەڕپێکراوی ڕوداوەکان داوە . و پەنجەی خستۆتە سەر هەندێك گێڕانەوەی باو وبڵاویش کە لە هەندێك لەسەرچاوەکانی سیرەدا هاتوون و هەڵبەستراو و لاواز و بێ ئەسڵ وئەساس وبێ سەنەد وسەرچاوەی زانستین. بەگشتی ئەم نامیلکەیە دەکرێت وەك یەکێك لەسەرچاوە وپرۆگرامەکانی خوێندن

وفێرکردنی مێردمناڵان پشتی پێ ببەسترێت. لەو شوێن وقوتابخانە وسەنتەر وناوەندانەدا کە ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیزیان ﷺ تێدا دەخوێنرێت.

لەپەیوەندی بە وەرگێڕانەکەی مامۆستا هۆشیار کەلاریشدا دەبێ ئەوە بڵێم کە تا حەزکەی خۆمانە ودڵگیر و گەرم وگوڕ و بێ گرێ وگۆڵ و دەستپاکانە تەرجەمەی کردووە و خوێنەری کورد ڕادەکێشێت و بێزاری ناکات و ئەوەندەش بۆن وبەرامە و هاڵ وهەوای کوردەواری بە وەرگێڕانەکە داوە. کە کەم هەست دەکەی دەقێکی وەرگێڕدراو دەخوێنیتەوە .

خوای پەروەردگار بەباشترین پاداشتی خۆی جەزای نووسەر و وەرگێڕ بداتەوە وبیخاتە سەر کێشانەی کردەوە چاکەکانیان بۆ ئەو ڕۆژەی کە هیچ کاروکردەوەیە وەرناگیرێ ونایخوا گوفتار وکرداری باش و لەبەر خوا ئەنجامدراو نەبێ. پەروەردگار ئێمەش لە شەفاعەتی ئەم شەفیع وپێغەمبەرە ﷺ سەروەر وسەردارە بێبەش نەکا و حەشرمان لەگەڵ ئەو بێ و بە ئاوی کەوسەری دەستی پیرۆزی تینوێتیمان بۆ هەتا هەتایە بشکێ.

وصلی الله وسلم علی رسول الله

بێستون ژاڵەیی

گەرمیان _ کەلار

٢ی شەوالی ١٤٤٠ ی کۆچی

٥ی حوزەیرانی ٢٠١٩ ی میلادی



# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان . سەڵات و سەلام وەك لێزمەی باران لەسەر پێغەمبەری ئاخر زەمان و یاران و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی پەسڵان.

پاشان:

فەزڵ و منەتی خوایە پاش ئەوەی چاپی یەکەمی کتێبی ( کورت و پوخت پێغەمبەرەکەت بناسە ) کەوتە بەر دیدی خوێنەران. هەر زوو ڕێکخراو و ناوەندە ئیسلامیەکان کردیان. بەمەنهەج و پرۆگرامی خوێندن بۆ فێرخوازەکانیان . هەروەها لەهەندێ شوێن بۆ پێشبڕکێ دیاری کرا. هەموو ئەم هۆکارانە و کورتی و پوختی و درووستی زانیارییەکانی بوە هۆی ئەوەی کە چاپی یەکەمی ئەم کتێبە کە تیراژەکەی ١٠٠٠ نوسخە بوو لەبازاڕ و کتێبخانەکاندا چاپی یەکەمی نەمێنێ.

لەبەر گرنگی کتێبەکە چەندین ڕێکخراو و ناوەندی ئیسلامی داوایان دەکرد کە چاپی دووەمی بکرێ . بەتایبەتی کاتێك پێمگەیشت کە کراوە بەمەنهەج و پرۆگرامی خوێندن لە هەریەکە لە شارەکانی کەلار و هەڵەبجە و چەمچەماڵ و ڕانیە و دەربەندیخان . هەروەها کاتێك برای بەڕێزم کاك مەریوان ئەحمەد خاوەنی کتێبخانەی گەشە داوای کرد کە چاپی دووەمی لەئەستۆ بگرێ . بۆیە منیش بڕیارمدا ڕەزامەندی دەربڕم و ناوەکەشی بگۆڕم بۆ (



دیاری بۆ ناسینی پێغەمبەری نوورانی ) . دواى ئەوەی كە كتێبی عەقیدەكە بەناوی ( دیاری بۆ شارەزابوون لە بیروباوەڕی ئیسلامی ) بڵاوبویەوە و گەر خوا ویستی لەسەربێ هەرسێ كتێبی ( دیاری بۆ شارەزابوون لە زانستی فەرموودەناسی و. دیاری لە پاداشتی ئیلاهی و. دیاری بۆ شارەزابوون لە چوار پایەی ئیسلامی ) بەڕێوەن بۆ وەرگێڕان و چاپكردن و هەروەها كتێبی ( دیاری بۆ شارەزابوون لە ڕێزمانی عەرەبی ) كەوتە بازاڕەوە پێمخۆشبوو ئەم ناوە بۆ چاپی دووەم و چاپەكانی تر - إن شاء الله - هەڵبژێرم.

داواكارم لەخوای پەروەردگار لێمانی قبوڵ بفەرموێت و قبوڵیش بەم بەرهەمە ببەخشێ و پاداشتی كاك مەریوان و كتێبخانەی گەشە بداتەوە.

وصلى الله وسلم على رسولنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

هوشیار نصرالدین كەلاری

٢٦/ ٤/ ١٤٤٢

١١/ ١٢/ ٢٠٢٠ كەلار

❊❊❊

# پێشەکی وەرگێڕ

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه..

أما بعد:

تاکە کەسایەتیە لەمێژوودا کە شوێنکەوتوەگانی ورد و زبری ژیان و گوزەرانیان گێڕاوەتەوە تەنانەت پێش لەدایکبونیشی، بگرە نەسەبی تا دەگاتەوە چەندین بەرەباب و باوانی کە بۆ هیچ کەسێکی تر شتی وا نەك نەکراوە، بەڵکو نیوەی ئەوەش نەکراوە و نەزانراوە.

زانایانی ئەم ئوممەتە لەکۆن و تازە گرنگیان بەگەورە و بچوکی ژیانی ئەم پێشەوایە داوە، لەهەموو ڕوویەکەوە بەچەندین نوسینی قەبارە جیاواز لەسەر ژیانی دواون، بەڵام هێشتا هەر ماویەتی و هێشتا هەر تاسوقی دڵ ناشکێنێ، چونکە ئەو پەیامبەر و خۆشەویستی خوایە { قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله}، چونکە ئەو ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان { وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين} . چونکە نور و ڕووناکیە بۆ سەر زەوی و جیهانی ڕووناك کردەوە و لەنەفامی ڕزگاری کردن، کۆتا پەیامی ئیلاهی بە بەندەکانی گەیاند و، تا لەژیاندا مابوو ئەوەی چاك و سودبەخش بوو بە ئوممەتەکەی گەیاند و ڕوونیکردەوە بۆیان و، لەقیامەتیش دا هەر لەهۆڵی ئوممەتی ئوممەتی دایە.

بەڵێ ئەگەرچی من وەک ڕێبوارێکی نامۆ و نەشارەزا و بێ زاد لە ڕێژینی ئەم سەرداره وێڵ و سەرگەردان و پەرێشانم وەکو مەحوی ئەفەرموێ:

چ مەدحێکت بکەم لائیق بەتۆ "یاخیر خلق الله"

منی بێ خێری نالائیق کە جبریلت سەناخوانە

بەڵام من ویستم بەم کورتە وەرگێڕانە خۆم بخزێنمە ئەو کاروانە پڕ شکۆیەی زانایان کە خزمەتیان بە سیرە و ڕێژین و ژیاننامەی ئەم پێغەمبەرە کردوە ﷺ .

ئەم نوسینەی بەردەستت وەکو گوزەرێکی خێرایە بەدیار ئەو هەموو وێستگە و ڕووداوانەی ژیانی ئەم زاتە گەورەیە، کە بێخود لەوەسفیدا ئەفەرموێ:

کە ڕۆژی هیجری ماتەمە و شەوی ویساڵی شاییە

کە سەدهەزاری وەك منی بەگیان و دڵ فیداییە

بەڵێ گوزەرێکی خێرایە هەر لەساتی هاتنە دونیاوە تاکو ساتی وەفاتیﷺ ، ئەگینا بەچەندین نوسین و توێژینەوە لەژیانی پڕ بەرەکەتی تێر نابی، وەکو فەنایی لە وەسفیدا ئەفەرموێ:

حوسنی خولق و سیرەتی وەك حوسنی ڕەنگ و سورەتی

شاهێدی دەعوایە ئەرێ گەوهەری یەکتایە ئەو

هەروەها ئەم وەرگێڕانەم بە یەکێك لە ئاواتە بەدیهاتوەکانی ژیانمی دەزانم چون زۆر لەمێژە بیرم لەوەها خزمەتێکە بە

پێشەواکەم ﷺ چ خزمەت کردن بێت بەفەرمایشتە شیرینەکانی یاخود ژیاننامەی پڕ وانە و پەند ئامێزەکانی، ئەوە جارێ خوا کردی ئەمەی دووەمی بەدیهاتوە و داواکارم لەخوای گەورە بەگەورەیی خۆی ئەم خزمەتە بچوکەم لێوەرگرێ و قەبوڵی پێببەخشێ و بیخاتە سەر میزانی چاکەکانم.

هەروەها سوپاس و دەستخۆشیم هەیە بۆ برای زۆر بەڕێزم کاک بێستون ژاڵەیی کە سەرەڕای سەرقاڵی بەکار و پڕۆژە خێرخوازییەکانی خۆیەوە ئەرکی پێداچونەوەی لەئەستۆ گرت و بەتێبینی و سەرنجەکانی و پێشەکیە جوانەکەی وەرگێڕانەکەی جوانترکرد. داواکارم لەخوای گەورە بیخاتە سەر میزانی چاکەکانی و پاداشتی بەخێرێکی زۆر و نەبڕاوە بداتەوە.

"وصلی الله علی" ئەو بەحری نوری عیلم و عیرفانە

کەدەرکی غەوری ناکا "غیر علم الله سبحانه"

هوشیار نصرالدین کەلاری

٨ /١٠/ ١٤٤٠ی کۆچی

١١ /٦/ ٢٠١٩ی لەدایکبون --- کەلار

❊❊❊

## سەبارەت بەم کتێبە:

وەك دیارە ئەم نوسینە نوسینی کتێب نیە. بەڵکو موسی ابن راشد العازمی خاوەنی کتێبی (اللؤلؤ المكنون في سيرة رسول المأمون) بە ٢٢٢ جریوە لەتۆڕی کۆمەڵایەتی تویتەر بڵاوی کردۆتەوە. هەمووی کراوە بە مەلەفێك و بڵاودەکرێتەوە. برایەکی بەڕێزیش - کەڕەنگە ئێستا خۆی لەبیری نەمابێ – لەڕێگەی واتسئەپەوە بۆی ناردم. منیش هەموو شەوانی جومعەیەك لەبری ئەوەی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك تەنها سەڵاواتێك بڵاوبکەمەوە دەستمکرد بە وەرگێڕانی ئەم نوسینە لەژێر ناوی (بەپوختی پێغەمبەرەکەت ﷺ بناسە) هەر حەفتە و زنجیرەیەکیم بڵاودەکردەوە. بەبێ هیچ دەستکارییەک تەنها سەرەبابەتم بۆ زیادکردووە بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر.

دواتر کە بینیم هاوڕێیان بەلایانەوە جێی بایەخە و بەگرنگیەوە تێی ئەڕوانن. بەتایبەتی پاش ئەوەی یەك دوو هاوڕێیەك بەدیاری کراوی داوای زیاتریان دەکرد ئیدی بیری کۆکردنەوەی هەمووی لەدوو توێی کتێبێکدا بوە شتێکی حاشا هەڵنەگر. هەروەها وەکو برای بەڕێزم کاك بێستون ژاڵەیی ئاماژەی پێداوە ئەم نوسینە بایی ئەوە گرنگ و بەکەڵکە کەبکرێتە پرۆگرامی خوێندن بۆ ئەو دەزگا و ڕێکخراو و ناوەندە ئیسلامییانەی کە گرنگی بەزانستی شەرعی دەدەن و هەروەها بۆ پێشبڕکێ لەسەر ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ئەم نوسینە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە ئەمەش هۆکاری دووەم بوو لەوەی کە هەوڵی کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بدەم.

ئەوەی شایانی باسە بەهۆی ئەوەی ئەم نوسینە لەناو هاندەکەم هەڵگرتبوو، هەر لەوێشەوە بەنامەی مەسنجەر وەرمدەگێڕا و دەمنوسیەوە و دەمنارد بۆ برایەکی بەڕێز بۆئەوەی هەمووی کۆبکاتەوە و دواتر پێکەوە بیخەمە سەر کاغەز بۆ پێداچونەوە و ئەوانە.

لەکۆتاییدا بەپێویستی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی هەریەکە لەمانە بکەم:

١ -کاك کارمەند عەزیز کە ئەرکی کۆکردنەوە و گۆڕینی لەنوسینی نامەی مەسنجەرەوە بۆ وۆردی کۆمپیوتەری زەحمەتی کێشا سەرەڕای سەرقاڵی خۆی بە خوێندنەوە لەبەشی ئەندازیاری و قۆناغی کۆتایی خوێندنەکەی. خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

٢ -کاك بێستون ژاڵەیی کە ئەرکی پێداچونەوە و پێشەکی بۆ نوسینی گرتە ئەستۆ.

٣ -خێرخوازێکی دەست و دڵ پاك کە نەیویست ناوی ئاشکرا بکەم، ئەرکی چاپکردنی گرتە ئەستۆ، خوای گەورە بیکاتە خێرێکی بەردەوام و نەبڕاوە بۆی و، ماڵ و سامانی زیادبکا و بەرەکەتداری بکات.

٤ -کاك زانا قەرەداغی کە ئەرکی سەرپەرشتیکردنی چاپکردنەکەی لە ئەستۆ گرت.

٥ -هاوسەر و هاوژینیماندوونەناسم کە ڕەنگە ئەو وەختی وەرگێڕانە هەندێک لە مافەکانی ئەوم پشتگوێ خستبێ، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە و زیاتر ئارامی پێ ببەخشێ.

❊❊❊

# قۆناغی

# پێش پێغەمبەرایەتی



* عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب ئامینەی کچی وەهبی خواست.

* ئامینە دووگیان بوو لە عبدالله .

* ئامینە سکی دوو مانگان بوو عبدالله کۆچی دوایی کرد.

* عبدالله (٥) وشتری لە دوای خۆی بەجێهێشتبوو. لەگەڵ هەندێ مەڕ و کەنیزەکێکی حەبەشی کەناوی بەرەکە بوو. واتە (أم أیمن).



* ئەوترێ لە (١٢)ی ڕەبیعول ئەوەڵدا ئامینە منداڵەکەی هاتە دونیاوە. (گیانم فیدایبێ)

* هیچ موعجیزەیەك نەسەلمێنراوە کە ڕوویدابێت لەکاتی لەدایکبونەکەدا .

* لە حەوتەم ڕۆژی تەمەنیدا. عبدالمطلب ی باپیری (سوننەت) خەتەنەی کرد و ناوی لێنا محمد ﷺ.

* ئامینە ماوەی (٣) ڕۆژ شیری دا بە منداڵەکەی (محمد ﷺ ).

دواتر ثوەیبەی کەنیزەکی ئەبولەهەب شیری پێدا کە پێشتر شیری دابوە حەمزە و ئەبوسەلەمە.

* دواتر حەلیمەی سەعدییە شیری دا بە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منالەکانی خۆی (عبدالله، شەیما، ئەنیسە).

* پێغەمبەر ﷺ (٧) خوشك و برای شیری هەبووە ( حەمزەو ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدالأسد و مەسروح و ئەبوسوفیان و عبدالله و شەیما و ئەنیسە ).

بەڵام هیچ برا و خوشکێکی دایك و باوکی نەبووە و تاقانەی دایك و باوکی بووە .

* شەقکردنی سینگی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لای حەلیمەی سەعدییە ڕوویدا، جبریل سینگی شەقکرد و دڵی بەئاوی زەمزەم شۆردەوە و بەشی شەیتانی لێدەرکرد و پاشان مۆری پێغەمبەرێتی دا لەپشتی، ئیدی پێغەمبەر ﷺلەو ساوە پارێزراوبوو لە شەیتان، لەکردار و گوفتاری دا.

* مەبەست لە مۆری پێغەمبەرایەتی، پارچە گۆشتێکە لەپشتەوە بەرامبەر دڵ بە ئەندازەی هێلکەی کۆترێک.

* پێغەمبەر ﷺ دوای دووساڵ لای حەلیمەی سەعدییە گەڕایەوە لای ئامینەی دایکی.

* لە تەمەنی (٦)ساڵیدا ئامینەی دایکی کۆچی دوایی کرد.

* دوای مردنی ئامینەی دایکی، عبدالمطلبی باپیری کەفالەتی پێغەمبەری گرتە ئەستۆ. لەتەمەنی ٨ ساڵیدا عبدالمطلب ی باپیریشی کۆچی دوایی کرد.

* دوای مردنی عبدالمطلب ی باپیری ئەبوتالبی مامی کەفالەت و بەخێوکردنی گرتە ئەستۆ.

* پێغەمبەر ﷺ شوانی کردووە.

* پێغەمبەر ﷺ بەشداری جەنگی فوججاری کرد.

* پێغەمبەر ﷺبەشداری پەیماننامەی فزوڵی کرد.

* پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ غوڵامەکەی کەناوی مەیسەرە بوو ڕۆشت بۆ بازرگانی کردن بۆ خەدیجە.

* پێغەمبەر ﷺ دایکە خەدیجەی خوازبێنی کرد و بوو بە هاوسەری.

* تەمەنی پێغەمبەر ﷺ (٢٥) ساڵ بوو، تەمەنی دایکە خەدیجە (٤٠) ساڵ بوو.

* پێغەمبەر ﷺ لە دایکە خەدیجە هەریەکە لە قاسم و زەینەب ڕوقیە وئوم کەلسوم و فاتیمە و عبدالله ی هەبووە.

* پێغەمبەر ﷺ ئامادەی نۆژەنکردنەوەی بینای کەعبە بوو لەسەردەستی قورەیش، تەمەنی (٣٥) ساڵ بوو. قورەیش پێکهاتن لەسەر پێغەمبەر ﷺ . بۆ دانانەوەی بەردە ڕەشەکە لەجێی خۆی.

* پێغەمبەر ﷺ پارێزرابوو لە ناشرینیەکانی سەردەمی جاهیلیەت: " نە بتی پەرستووە و نە عەرەقی خواردۆتەوە و نە زیناشی کردووە".

* پێغەمبەر ﷺ بە ڕاستگۆ و ئەمانەت پارێز و خاوەن هەموو ڕەوشتێکی جوان ناسراوبوو.

# قۆناغی پێغەمبەرایەتی و ڕووداوەکانی دوای ئەوە



* کاتێك تەمەنی پێغەمبەر ﷺ گەیشتە (٤٠) ساڵ شوێنەواری پێغەمبەرایەتی پێوە دەردەکەوت : خەوبینینی چاك و گۆشەگیری و سەلامکردن لێی لەلایەن دار و بەردەوە .

* هەر لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا سروش ( وەحی ) بۆ دابەزی بە سورەتی ( إقرأ) لە ئەشکەوتی حیڕاء.

* دوای دابەزینی (إقرأ) ماوەیەك وەحی پچڕا و دواتر وەحی دابەزیەوە بە سورەتی (المدثر).



* بانگەواز لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ دابەش دەبێ بۆ:
سەردەمی مەککە و سەردەمی مەدینە.
سەردەمی مەککەش دابەش دەبێ بۆ:
قۆناغی نهێنی و قۆناغی ئاشکرا .

* پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی دەستیکرد بە بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی و لە خانەوادەکەیەوە دەستی پێکرد، خێزانەکەی

خەدیجە و کچەکانی و عەلی و زەیدی کوڕی حاریثە (ڕەزای خوایان لێبێ).

* پاشان لە دەرەوەی ماڵەکەی بانگەوازی ئەوکەسانەی دەکرد کە متمانەی پێیان هەبوو. جا ئەبوبەکری سدیق موسڵمان بوو. پاشان خەڵکی بانگەوازی پێغەمبەریان ﷺ بیست. هەژار و چەوساوەکان خێرا هاتنە ناو دینی ئیسلامەوە.

* (٣) ساڵ بەسەر بانگەوازی نهێنیدا ڕۆیشت و خەڵکانێك موسڵمان بوون و شوێن دینی پێغەمبەر ﷺ کەوتن.

* پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئاشکراکردنی بانگەواز و فەرمووی: {هەر فەرمانێکت پێدراوە ( ئەی محمد ﷺ ) بە ڕێك و پێکی ئەنجامی بدە و گوێ مەدە بە بوختان و ڕەفتاری بێباوەڕ و هاوەڵ پەیداکەران}.

* پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتە سەر کێوی سەفا و بەئاشکرا ڕایگەیاند کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە و بۆ جنۆکە و ئادەمی هاتووە.

* یەکەمین کاردانەوەی قوڕەیش ناردنی وەفدێك بوو بۆلای ئەبوتالبی مامی بۆ ڕێگریکردن لە بانگەوازەکەی.

* هەوڵەکانی قورەیش بەنێوەندگیری ئەبوتالب سودی نەبوو بۆ ڕێگریکردن لە بانگەوازەکەی پێغەمبەرﷺ. پاشان وەلیدی کوڕی موغیرەیان نارد بۆ لای بۆ ئەوەی هەندێ شتی دونیایی بخاتە بەردەست. بۆیە وەلیدی کوڕی موغیرە هەوڵی خۆیدا، بەڵام پێغەمبەرﷺ قورئانی بەسەردا خوێند. زۆر کاریگەری کردە سەر وەلید. وەلید گەڕایەوە بۆ لای قورەیش و ئامۆژگاری کردن شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەون. یان لێگەڕێن با لەناو عەرەب بانگەوازەکەی بگەیەنێت. بەڵام قورەیش بەقسەیان نەکرد. وەلید تۆمەتی سیحربازی دایە پاڵ پێغەمبەرﷺ .

* سەبارەت بە وەلیدی کوڕی موغیرە چەن ئایەتێك لەسورەتی (المدثر) دابەزی، موژدەی دۆزەخی پێدەدات لەوانە: {ذرني ومن خلقت وحيدا}.

* لەم ماوەیە عبدالله ی کوڕی ئوم مەکتومی نابینا موسڵمان بوو. کە دواتر بووە بانگبێژی ئیسلام لەدوای بیلال (ڕەزای خوایان لێبێ).

* ئەو شێوازانەی قورەیش بەکاریدەهێنا لە دژایەتیکردنی بانگەوازەکەی پێغەمبەرﷺ .

وروژاندنی گومان سەبارەت بە قورئان، دژایەتیکردنی قورئان، گفتوگۆ و هەوڵدان بۆڕازیکردنی بە ماڵ و پۆستی دونیایی.

* قورەیش سەرکەوتو نەبوون لە هەوڵەکانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ

* قوڕەیش بیری لە شێوازێکی تری دژایەتی کردەوە. ئەویش: ئازار و ئەشکەنجەدانی ئەوانەی کە موسڵمان بوون. تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورس بوو لەسەر هاوەڵان.

* خوای گەورە بەهۆی ئەبوتاڵیبی مامیەوە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەپاراست.

* توندترین و سەختترینی ئەشکەنجەدان لەناو هاوەڵان ڕوبەڕووی خەبابی کوڕی ئەرەت بوەوە.

* ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) هەستا بەکارێکی زۆر گەورە. ئەویش:کڕینی کۆیلە موسڵمان بووەکان و پاشان ئازادکردنیان بوو. لەوانە: بیلال و عامری کوڕی فوهەیرە.

* قوڕەیش بەردەوام بوون لە ئەشکەنجەدانی ئەوانەی کە موسڵمان دەبوون، تا دەهات فیتنەکە قورستر دەبو لەسەر هاوەڵان. بۆیە پێغەمبەر ﷺمۆڵەتی دان بە کۆچ کردن بۆ حەبەشە.

* کۆمەڵێ لە هاوەڵان کە (١١) پیاو و (٤) ژن بوون دەرچون بەرەو حەبەشە لە یەکەمین کۆچ کردن لە ئیسلامدا. لەوانەی کە لەم کۆچ کردنەدا بەشداربوون عوسمانی کوڕی عەفان وخێزانەکەی(ڕوقیە) بوون. ئەمیرەکەشیان عوسمانی کوڕی مەظعون بوو.

* سورەتی (النجم) دابەزی و پێغەمبەر ﷺ لە تەنیشت کەعبە بەدەنگی بەرز خوێندییەوە. کە گەیشتە ئایەتی سوژدە. سوژدەی برد و موشریکەکانیش لەبەرگەورەیی ئایەتەکان سوژدەیان برد.

* هەواڵی سوژدەبردنی موشریکەکان بە شێواوی گەشتە کۆچ کردوەکانی حەبەشە. ئەویش گوایە خەڵکی مەککە موسڵمان بون. بۆیە ژمارەیەکیان گەڕانەوە.

* حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (ڕەزای خوای لێبێ) موسڵمان بوو. لەدوای ئەویش عومەری کوڕی خەتتاب موسڵمان بوو. بانگەوازی ئیسلام بەهۆی ئەم دوو پیاوەوە بەهێزتر بوو لە پێشوتر.

* هیچ شتێك بە ڕاستی نەهاتووە لەسەر چۆنیەتی موسڵمان بونی عومەر (ڕەزای خوای لێبێ). چیرۆکە بەناوبانگەکەی کاتێ داویەتی لە خوشکەکەی و تادوایی. ئیبنو ئیسحاق تەخریجی کردووە بەبێ سەنەد!

* قوڕەیش دەستیکرد بە شێوازێکی تر لە ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەرﷺ. ئەویش : هەوڵدان بۆ فریودانی بە پارە و ماڵی دونیا و ژن و پلە و پۆست و پاشایەتی، لەبەرامبەر وازهێنان لە بانگەوازەکەی.

* قوڕەیش عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەم داوایانەوە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەمووی ڕەتکردەوە.

* قوڕەیش دوای ئەوە داواکارییەکانی لە پێغەمبەر ﷺ زیاتر و توندتر کرد. وەکو داواکردنی موعجیزە و بینینی فریشتە و ڕێکردنی ڕوباری ئاو و... تادوایی.

* قورەیش جارێکی تر گەڕایەوە سەر ئازاردان و لەناوبردنی موسڵمانەکان بەتایبەتی هەژارەکانیان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دان جارێکی تر کۆچ بکەن بۆ حەبەشە.

* ژمارەی کۆچ کردوانی دووەم بۆ حەبەشە (٨٢) پیاو و (١٨) ئافرەت بوون.

* کۆچ کردنی دووەمی حەبەشە لەوەی پێشوتر ناڕەحەتتر و قورستر بوو بۆ موسڵمانەکان، چونکە لەلایەن قورەیشەوە ڕووبەڕووی ئازار و ناڕەحەتی بونەوە.

* لە ڕێگادا مارێك بە خالدی کوڕی حیزامیەوە داو و بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خوای لێبێ).

* کاتێ قورەیش زانیان دینی ئیسلام لە بڵاوبونەوەیەکی خێرادایە، کۆبونەوە لەسەر بڕیارێکی ستەمکارانە: نوسینی بەڵێننامەیەك بە دابڕین و پچڕاندنی هەموو جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ بەنو هاشم و بەنو موطەلب.

بە پوختی: کەس شتیان لێ نەکڕێ و کەسیش شتیان پێ نەفرۆشێ، لەگەڵیان دانەنیشن و تێکەڵییان نەکەن، ژنیان پێ نەدرێ و ژنیشیان لێ نەخوازرێ.

* بەنو هاشم و بەنو موطەلب لە دۆڵێك کۆبوونەوە، دواتر ناونرا دۆڵی ئەبو طالب.

* ئەم دابڕان و پچڕاندنی پەیوەندییە (٣) ساڵی خایاند، زۆر قورس بوو لەسەریان و برسێتی و تینوێتی زۆری بۆ هێنان، تا وای لێهات هیچ خواردنێك دەست نەدەکەوت بیخۆن.

* له ماوەی دابڕانەکە زانای ئوممەت و موفەسیری قورئان عبداللەی کوڕی عەباس لەدایکبو( ڕەزای خوایان لێبێ) .

* چەن کەسێ لە قورەیش کە هاوسۆزی دابڕێنراوەکانی ناو دۆڵەکە بون، توانیان بڕۆنە ناو کەعبەوە و پەیماننامە ستەمکارانەکە بدڕن.

* دوای دابڕانەکە ئەبو تاڵیبی مامی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد.

* پێغەمبەر ﷺ لەکاتی سەرە مەرگی مامیدا داوای باوەڕهێنانی لێکرد. بەڵام خوا قەدەری نەکردبوو باوەڕ بهێنێ و بە بێباوەڕی کۆچی دوایی کرد.

* ئەبوتاڵیب بە کافری مرد. پێغەمبەر ﷺ غەمباری بوو. فەرمووی: (داوای لێخۆشبونت بۆ ئەکەم تاوەکو ڕێگریم لێنەکرێ).

* ئایەت دابەزی لە سورەتی تەوبە. {خوای گەورە ڕێگری دەکات لە پێغەمبەرەکەی و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە داوای لێخۆشبون کردن بۆ موشریکەکان ئەگەر نزیکترین کەسیش بێت}.

* خوای گەورە ئەفەرموێ: {بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە. ڕەوا نیە داوای لێ خۆشبوون بۆ موشریک و هاوەڵگەڕان بکەن هەر چەندە ئەوانە خزمی نزیکیش بن، دوای ئەوەی کە بۆیان ڕوون بۆتەوە کە بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن (بەهۆی بێ دینی و تاوان و گوناهیانەوە)}.

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (سوکترین عەزابی خەڵکی دۆزەخ عەزابی ئەبوتاڵیبە، نەعلێکی لە پێیە بەهۆیەوە مێشکی دەکوڵێ) (مسلم گێڕاویەتیەوە).

* دوای ئەبوتاڵیب خەدیجەی کچی خوەیلد کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خوای لێبێ). لە گۆڕستانی مەککە نێژرا.

* جبریل بە پێغەمبەری فەرمووﷺ: ( مژدەیماڵێك لە مرواری ناوبۆش بدە بە خەدیجە لە بەهەشت نە ژاوە ژاوی تێدایە و نە ماندوو بوون) (متفق علیە).

* جبریل بە پێغەمبەری فەرموو: (ئەوە خەدیجەیە. ئەگەر هات بۆلات سەلامی لێ بکە لە لایەن خواوە و پاشان لەلایەنی منیشەوە) (متفق علیە).

* پێغەمبەر ﷺ زۆر غەمباربوو بە مردنی مامی و خەدیجەی خێزانی، بەڵام جێگیر نەبووە ئەو ساڵەی ناونابێ ساڵی غەمباری (عام الحزن).

* پێغەمبەر ﷺ لەدوای خەدیجە دایکە عائیشەی مارە بڕی (ڕەزای خوایان لێبێ ). عائیشە یەکەمین خێزانی بوو لە دوای خەدیجە.

* پێغەمبەر ﷺ سەودەی کچی زەمعەی مارە بڕی و گواستیشیەوە. سەودە یەکەمین خێزانی بوو لە دوای خەدیجە.

* سەودە ماوەی (٣) ساڵ بەتەنها خۆی بوو لەخزمەتی پێغەمبەرﷺ. هەروەها زۆر پابەندی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو.

* قورەیش دوای وەفاتی ئەبوتاڵیب زیاتر و توندتر ئازاری پێغەمبەریان دەدا ﷺ. گەمژەگەلێك پێیان دەوێرا كە پێشتر پێیان نەدەوێرا.

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (قورەیش شتێكی پێ نەكردم پێمناخۆشبێ تا ئەبوتاڵیب وەفاتی كرد). (بەیهەقی لە دلائل النبوة ڕیوایەتی كردووە بەسەنەدێكی سەحیح)

* ئەبوجەهل (لەعنەتی خوای لێبێ) هەوڵیدا لەكاتی سوژدەدا پێ بخاتە سەر گەردنی موبارەكی. بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەكەی پاراست.

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (ئازار دراوم لەپێناوی خوا لەكاتێكدا كەس ئازار نەدەدرا. ترسێنراوم لەپێناوی خوا لەكاتێكدا كەس نەدەترسێنرا). (ئیبنوماجە ڕیوایەتی كردوە و ئەلبانی ئەفەرموێ سەحیحە)

* ئەبوبەكری سدیق مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر ﷺ كە كۆچ بكات بۆ حەبەشە. بەهۆی سەختی بارودۆخەكە لەمەككە. ئەویش مۆڵەتی دا.

* ئەبوبەكر كەوتەڕێ بەرەو حەبەشە تاگەیشتە ناوچەی بەركولغیماد. پیاوێك پێی گەشت پێی ئەوترا ئیبنو دوغنە.

* ئیبنو دوغنە گەورەی هۆزی قارە بوو. داڵدەی ئەبوبەكری دا و پێی وت: بگەڕێوە لە مەككە خوای خۆت بپەرستە. قورەیشیش نكوڵی نەكرد.

* قورەیش پەست بون لە داڵدەدانی ئەبوبەكری سدیق لەلایەن ئیبنو دوغنەوە. لەبەرئەوەی ئەبوبەكر قورئانی بەدەنگی بەرز دەخوێندەوە.

* ئیبنو دوغنە بە ئەبوبەكری وت: ئیتر قورئان بەدەنگی بەرز مەخوێنەوە. ئەبوبەكریش داواكەی ڕەت كردەوە و داڵدەكەی ئیبنو دوغنەی گەڕاندەوە و لەمەككەیش مایەوە.

* بارودۆخەکە زیاتر سەخت بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە مەککە. بەپێ بەرێکەوت بەرەو تائیف و بانگیکردن بۆ ئیسلام

* پێشوازیکردنی خەڵکی تائیف بەردبارانکردنی پێغەمبەر بوو ﷺ . بەتایبەتی پێیەکانی شەریفی، تا خوێنی پیادا دەچۆڕا.

* پێغەمبەر ﷺ بەغەمباریەوە لە تائیف دەرچوو. بەهۆش نەهات تا گەیشتە قەڕنولمەنازل.

* جبریل (علیه السلام ) دابەزی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و فریشتەی کێوەکانیشی لەگەڵبوو. هەواڵی پێدا بە لەناوبردنی تائیف یان ئارامگرتن. پێغەمبەر ﷺ ئارامگرتنی هەڵبژارد.

* پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەککە. ڕۆشتە ناو مەککەوە لەژێر داڵدەی موتعەمی کوڕی عەدی.



# ڕووداوی

# ئیسرا و میعراج



* دوای چەندین ساڵ لە بانگەواز، ڕووداوی ئیسڕا و میعراج هاتە پێش وەکو دڵنەوایی و دڵ دامەزراوی و ڕێزێك بۆ پێغەمبەر ﷺ.

* خوای گەورە باسی ئیسڕای کردوە لە سورەتی ئیسڕا و باسی میعراجیش لەسورەتی نەجم.

* گەشتی ئیسڕا و میعراج بەیەکێك لەگەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پێ شەرەفمەندکرد.

* گەشتەکە کەمتر لە شەوێکی خایاند. پێغەمبەر ﷺ دوای نوێژی عیشا بەڕێکەوت و پێش نوێژی بەیانی گەڕایەوە.



* گەشتەکە لەوەوە دەستیپێکرد کاتێ جبریل (علیه السلام) هات بۆلای پێغەمبەرﷺ. لە ماڵەکەی خۆی دەری کرد و بردی بۆلای کەعبە.

* لەوێ سینگی پێغەمبەری دڕی و دڵی موبارەکی دەرهێنا و بە ئاوی زەمزەم شوشتی و پاشان پڕی کرد لە ئیمان و دانایی، دواتر خستیەوە شوێنی خۆی و سینگی موبارەکی دووریەوە.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ سواری بوراق بوو، جبریلیشی لەگەڵ بوو، هێندەی پێنەچوو گەشتنە قودس.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو مزگەتی ئەقسا لەگەڵ جبریلدا (علیه السلام )، بینی خوای گەورە هەموو پێغەمبەران و نێردراوانی زیندوو کردۆتەوە.

* ژمارەی نێردراوان ( الأنبیاء ) ١٢٤ هەزارە، بەڵام پێغەمبەران (المرسلین ) ٣١٥ یە، ئەمە لەفەرموودەکەی ئەبوزەڕ هاتووە (ڕەزای خوای لێبێ )، کە ئیبنوحیبان لە سەحیحەکەی هێناویەتی.

* کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ، جبریل ( علیه السلام) پێغەمبەری پێشخست بۆ ئەوەی ببێتە ئیمامی نوێژ بۆ پێشەوایانی خەڵکی کە پێغەمبەران و نێردراوانن.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژی تەواوکرد، میعراجیان بۆ هێنا ( کە بریتیە لە پەیژە، پلەکانە )، بەڵام کەس شێوە و ئەندازە و قەبارەکەی نازانێ جگە لە خوای گەورە .

* پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جبریل دا سەرکەوتن بەرەو ئاسمان. هێندەی پێنەچوو گەشتنە ئاسمانی دونیا و بۆیان کرایەوە و پێغەمبەر ﷺ شت گەلێکی سەرسوڕهێنەری بینی .

* پێغەمبەر ﷺ باوکی مرۆڤایەتی، ئادەمی بینی (علیه السلام ).

* پێغەمبەر ﷺ لەم ئاسمانی دونیایە حاڵی زەمکاران و،سوخۆران و زیناکاران و ماڵی یەتیم خۆرانی بینی.

* پاشان پێغەمبەرﷺ، جبریل (علیه السلام) سەرکەوتن بۆ ئاسمانی دووەم. پێغەمبەر ﷺ یەحیای کوڕی زەکەریا وعیسای کوڕی مەریەمی بینی( سەلامی خوایان لەسەربێت).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ و جبریل سەرکەوتن بۆ ئاسمانی سێیەم پێغەمبەر ﷺ یوسفی بینی (علیه السلام). پێغەمبەرﷺ دەربارەی جوانیەکەی فەرمووی: نیوەی جوانی پێبەخشراوە.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ و جبریل سەرکەوتن بۆ ئاسمانی چوارەم و لەوێ ئیدریسی بینی (علیه السلام ).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ و جبریل سەرکەوتن بۆ ئاسمانی پێنجەم و هارونی بینی ( علیه السلام ).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ و جبریل سەرکەوتن بۆ ئاسمانی شەشەم و لەوێ موسای بینی (علیه السلام ).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ و جبریل سەرکەوتن بۆ ئاسمانی حەوتەم و لەوێ باوکی پێغەمبەران ئیبراهیمی بینی (علیه السلام ).

* ئیبراهیم (علیه السلام) بە پێغەمبەری فەرموو: (سەلامی من بگەینە بەئوممەتەکەت و پێیان ڕابگەیەنە کە بەهەشت خاکەکەی بەپیتە و ئاوەکەی سازگارە و چاندنیش تیایدا بریتیە لە: سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر).

* دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە ئیبراهیمی باوکی جیابووەوە. لەگەڵ جبریلدا (علیه السلام) ڕۆشتنە ناو بەهەشتەوە و چەندین دیمەنی پیشاندرا.

* پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشت : کۆشکێکی عومەری کوڕی خەتتاب و ڕووباری کەوسەر و کەنیزەکێکی زەیدی کوڕی حاریثەی بینی و دواتر هەواڵی پێدان.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ دۆزەخیشی بینی کە بەشێکی بەشێکی تری تێکدەشکێنێ. ( خوا بمانپارێزێ و پەنامان بدات ).

* هەروەها مالیکی پاسەوان و ئەمینداری دۆزەخی بینی.

پاشان جبریل (علیه السلام) پێغەمبەری بەرزکردەوە بەرەو سەروی ئاسمانی حەوتەم و خۆی وەستا و پێی وت : (ئەی محمد پێش کەوە. والله یەك هەنگاوی تر پێش بکەوم دەسوتێم).

پێغەمبەر ﷺ پێش کەوت و گەشتە شوێنێ هیچ پێغەمبەر و فریشتەیەك پێی نەگەیشتووە.

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە شوێنێ گوێی لە جیرەی قەڵەمەکان دەبوو کە قەزا و بڕیارەکانی خوایان دەنوسیەوە. وەکو ڕێزێك لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتە.

* لەوێدا و لەوشوێنە بەرز و پڕ شکۆیەدا. خوای گەورە قسەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا کرد و پێنج نوێژەکەی لەسەر خۆی و ئوممەتەکەی فەرز کرد.

* خوای گەورە: پێنج نوێژەکەی بەخشیە ئەم ئوممەتە و لە تاوانی هەموو موسڵمانێ خۆشدەبێ هەتا تاوانە گەورەکانیش ( واتە بەهۆی تاوانی گەورەوە لەدۆزەخ بەهەتا هەتایی نامێنێتەوە ) هەروەها کۆتاییەکانی سورەتی بەقەرەیشی بەخشیە ئەم ئوممەتە کە جیای دەکاتەوە لە ئوممەتانی تر.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لای جبریل و لەوێشەوە بۆ قودس و مزگەوتی ئەقسا و پاشان بە سواری بوڕاقەکە (کە لە ئێستر بچوکترە و لە گوێدرێژ گەورەترە) گەڕایەوە مەککە.

* هەموو ئەم گەشتە و ڕووداوە گەورەکانی ناوی لە کەمتر لە شەوێکدا ڕوویاندا. ئەمەش بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە. هەربۆیە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا باسەکەی گێڕاوەتەوە تا قیامەت.

* جبریل (علیه السلام) دوای ڕۆژێ لە ڕووداوە گەورەکەی ئیسرا و میعراج دابەزی بۆلای پێغەمبەر ﷺ. بۆ ئەوەی کاتەکانی نوێژی بۆ ڕوون بکاتەوە.

* سەرەتا نوێژ دوو ڕکات فەرزبوو. جگە لە نوێژی مەغریب کە هەر سێ ڕکات بووە.

* سەرەتا قیبلە مزگەوتی ئەقسا بوو. پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نوێژی بکردایە کەعبەی ئەخستە نێوان خۆی و قیبلەوە ( مزگەوتی ئەقسا ). بەمشێوەیەش هەردوو قیبلەکەی ئەپێکا.

* قورەیش داوای موعجیزەیەکی هەستپێکرواییان دەکرد. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر مانگ بکەمە دوولەتەوە بۆتان باوەڕ ئەهێنن؟
وتیان: بەڵێ .

* پێغەمبەر ﷺ داوای لە خوای بەدەسەڵات کرد. کە مانگ بکاتە دوولەتەوە. خوای گەورە و بەدەسەڵات مانگی بە بەرچاوی قورەیشەوە کردە دوولەتەوە.

* کاتێ قورەیش ئەم موعجیزە سەرسوڕهێنەرەیان بینی وتیان: واللە تۆ ساحیری و. باوەڕیان نەهێنا و نکوڵیان کرد.

* خوای گەورە ئەم ئایەتانەی سەرەتای سورەتی قەمەری دابەزاند:
﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ۝٣﴾

# بانگەوازی پێغەمبەر ﷺ
# بۆ هۆزەکانی تر و کۆچ کردن
# بۆ مەدینە



* ئا لەم کاتەوە پێغەمبەر ﷺ بیری لەوە کردەوە کە بانگەوازی هۆزەکانی تری عەرەب بکات لە وەرزی حەجدا، بەڵکو هۆزێك باوەڕی پێ بهێنێ و سەری بخا.

* ئەبولەهەبی مامی (نەفرەتی خوای لێبێ) بەدوایەوە بوو، کاتێ بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد و دەیوت باوەڕی پێ مەکەن ڕاست ناکا.

* هەڵوێستی هۆزەکانی عەرەب جیاوازبوو سەبارەت بە پێغەمبەرﷺ، هەیان بوو باوەڕی پێ نەدەهێنا و هەیان بوو تەماحی دەسەڵات و جێنیشینی هەبوو لەدوای خۆی، هەشیان بوو بێدەنگ بوو.



* لەساڵی (١١)ی پێغەمبەرایەتیدا پێغەمبەر ﷺ گەشتە (٦) کەس لە خەزرەج و خوای گەورە خێری بۆیان ویست، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان کۆبووەوە و بانگیکردن بۆ ئیسلام .

* ئەو چەن کەسە باوەڕیان هێنا و موسڵمان بوون ئەوانیش:

ئەسعەدی کوڕی زوراره و عەوفی کوڕی حارس و ڕافعی کوڕی مالك و قوتبەی کوڕی عامر وعوقبەی کوڕی عامر و جابری کوڕی عبدالله.

* ئەمانە گەڕانەوە مەدینە و باسی پێغەمبەریان بۆ قەومەکەیان دەکرد و بانگیان دەکردن بۆ ئیسلام تا بڵاوبووەوە لەناویاندا. تاوای لێهات هیچ ماڵێ نەما کە باسی پێغەمبەری تیا نەکرێت.

* لە ساڵی (١٢)ی پێغەمبەرایەتی و لە وەرزی حەجدا، (١٢) پیاو لە ئەنسارِ هاتن بۆ حەج.

* ئەم وەفدە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کۆبونەوە و بەیعەتیان پێدا بەیعەتی عەقەبەی یەکەم.

* بەیعەتەکە درا لەسەر:

گوێبیست و گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خۆشی و ناخۆشی و کاتی بەهێزی و لاوازی، هەروەها سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر هات بۆلایان بۆ مەدینە.

* ناوی ئەو هاوەڵانەی کە لە بەیعەتی عەقەبەی ئامادە بوون.

* ئیبنوهیشام لەسیرەکەیدا ناوی ئەو (١٢) هاوەڵەی باسکردوە کە ئامادەی بەیعەتی عەقەبەی یەکەم بوون، ئەوانیش:

١- ئەسعەدی کوڕی زوراره.

٢- عەوفی کوڕی عەفرا.

٣- موعازی کوڕی عەفرا.

٤- ڕافعی کوڕی مالك.

٥- زەکوانی کوڕی عەبدقەیس.

٦- عوبادەی کوڕی صامت.

٧- یەزیدی کوڕی سەعلەبە.

٨- عەباسی کوڕی عوبادە.

٩- عوقبەی کوڕی عامر.

١٠- عامری کوڕی حەدیدە.

١١- ئەبولهەیسەم مالکی کوڕی تەیهان.

١٢- عومیمی کوڕی ساعیدە.

* کاتێ وەفدی ئەنسار ویستیان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەرﷺ موسعەبی کوڕی عومەیری نارد لەگەڵیان، بۆئەوەی لەدین شارەزایان بکات.

* هەردوو گەورەی بەنی لئەشهەل لەسەردەستی موسعەبی کوڕی عومەیر موسڵمان بوون: سەعدی کوڕی موعاز و ئوسەیدی کوڕی حوزەیر( ڕەزای خوایان لێبێ ).

* موسعەب لەماڵی سەعدی کوڕی زوراره ئەمایەوە و بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام تا وای لێهات هیچ ماڵێ نەما لە مەدینە مەگەر باسی ئیسلامی تێدا دەکرا.

* لەساڵی(١٣)ی پێغەمبەرایەتیدا، (٧٣) پیاو و(٢) ئافرەت لە ئەنسار دەرچوون بۆلای پێغەمبەر ﷺ لەوەرزی حەجدا، بۆ ئەنجامدانی گەورەترین ڕێککەوتن لە مێژووی ئیسلامدا.

* پەیوەندی نهێنی لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و ئەو(٧٣) کەسە هەبوو، کە لە ناوەڕاستی ڕۆژانی تەشریقدا لە دۆڵی لای عەقەبە کۆببنەوە.

* لەشەوی دیاریکراودا، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (٧٣) پیاو و(٢) ئافرەتەکە کۆبوەوە، بەمەبەستی ئەنجامدانی بەیعەتدانی گەورە کە دواتر بە بەیعەتی عەقەبەی دووەم ناسرا.

* بەندەکانی بەیعەتەکە بریتی بوون لە:

* گوێگرتن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خۆشی و ناخۆشی، هەروەها سەرخستنی و پاراستنی ئەگەر کۆچی کرد بۆلایان.

* وتیانە پێغەمبەر ﷺ، چیمان بۆ هەیە ئەگەر وەفامان بە بەیعەتەکەوە کرد؟

فەرمووی : بەهەشتتان بۆهەیە، هەموویان بەکۆڕا ڕازی بوون.

* یەکەمین کەس بەیعەتی دا بە پێغەمبەرﷺ، بەڕائی کوڕی مەعرور بوو ( ڕەزای خوای لێبێ ) پاشان باقی سەرانی تری ئەنسار.

* لەم بەیعەتەدا باسی جیهادکردن نەهاتووە. چونکە جیهادکردن لەساڵی یەکەمی کۆچیدا فەرزبوو. هەربۆیە ئیبنوئیسحاق و بەدوایدا ئیبنوهیشام بەهەڵەداچوون لەوەی کە لە سیرەکەیاندا باسی جیهادیان کردووە وەکو بەندێك لەم بەیعەتە.

* ئابەم شێوەیە بەیعەتی عەقەبەی دووەم ئەنجامدرا. کە دواتر بووە هۆی کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ مەدینە و بونیادنانی دەوڵەتی ئیسلامی.

* کەعبی کوڕی مالك ئەفەرموێ: من ئامادەی بەیعەتی شەوی عەقەبە بووم. کاتێ بەیعەتماندا لەسەر ئیسلام. پێم خۆش نیە بەشداری غەزای بەدر بووبم لەبری ئەو شەوە !

* کاتێ ئەنسارِ گەڕانەوە بۆ مەدینە. پێغەمبەر ﷺ دڵی زۆرخۆشبوو بەوەی کە خوای گەورە کەسانێکی کردە پارێزگاری و دۆستی ئەوانیش ئەنسارِ بوون.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی کۆچ بکەن بۆ مەدینە و بگەن بەبراکانیان لە ئەنسارِییەکان.

-پێغەمبەرﷺ فەرموی: فەرمانم پێکراوە کۆچ بکەم بۆ شارێك کە شارەکانی تر دەخوات و پێی دەوترێ یەسریب کە مەدینەیە. خەڵکە خراپەکەی دەردەکات وەکو چۆن کوورە ژەنگی ئاسن لادەبات.

* هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) دەستیان کرد بە کۆچ کردن بۆ مەدینە کۆمەڵ کۆمەڵ و دەستە دەستە و جیا جیا و بەنهێنی و شاراوەیی و بەپیادە و سواری.

* پێغەمبەر ﷺ مایەوە و چاوەڕێی فەرمانی خوای دەکرد کە مۆڵەتی بدا بە کۆچ کردن.

* بەڕائی کوڕی عازب ئەفەرموێ: یەکەمین کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هات بۆلامان: موسعەبی کوڕی عومەیر و عەبدوڵای کوڕی ئوم مەکتوم بوو، پاشان عەمارِ و بیلال و سەعد هاتن.

* کۆچ کردنی هاوەڵان هەروا ئاسان نەبوو، بەڵکو قوڕەیش هەموو ڕێگەیەکی دەگرتە بەر بۆ ڕێگریکردن لە کۆچ کردنی هاوەڵان .

* ئەبوسەلەمەی کوڕی عبدالأسد وعامری کوڕی ڕەبیعە و خێزانەکەی لەیلای کچی ئەبوحەسمە و بەنی جەحش کۆچیان کرد بەرەو مەدینە .

* عومەری کوڕی خەتتاب و عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاص پێکەوە و بەشەو و بەشاراوەیی و نهێنی کۆچیان کرد. ( ئیبنوئیسحاق بەسەنەدێکی سەحیح گێڕاویەتیەوە لەسیرەکەیدا)

* ئەوەی دەوترێ گوایە عومەری کوڕی خەتتاب بە ئاشکرا کۆچی کردووە و وتویەتی: کێ ئەیەوێ دایکی ڕۆڵەڕۆی بۆبکا و منداڵی هەتیوبکەوێ و... تادوایی، ڕیوایەتێکی لاوازە و جێگیرنەبووە.

* دوو مانگ بەسەر بەیعەتی عەقەبەدا تێنەپەڕی هەموو موسڵمانانی مەککە کۆچیان کرد بۆ مەدینە.جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری سدیق و کەسانێ کە پاساویان هەبوبێ مابوونەوە.

* پێغەمبەر ﷺ دڵنیابووەوە لەوەی کە هیچ موسڵمانێ نەماوە لە مەککە، مەگەر کەسێ کۆت و بەندکرابێ، یا نەخۆش بێ، یا توانای کۆچ کردنی نەبووبێ.

* ئەبوبەکری سدیق زۆرجار داوای مۆڵەتی دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی کۆچ بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (پەلەمەکە ڕەنگە خوای گەورە هاوەڵێکت بۆ دابنێ).

* مۆڵەت هات لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەر ﷺ بە کۆچ کردن و بە هاوەڵێتی ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) .

* پێغەمبەر ﷺ هەواڵیدا بە ئەبوبەکر بۆ کۆچ کردن و بە یاوەری خودی ئەبوبەکر، ئەبوبەکریش دوو وشتری چاکی ئامادەکرد بۆ خۆی و پێغەمبەر ﷺ .

* کافرانی قوڕەیش لە دارولنەدوە کۆبونەوە و ڕێککەوتن لەسەر هەوڵێکی ستەمکارانە، ئەویش تیرۆرکردن و کوشتنی پێغەمبەر بوو ﷺ، دیاری (١٠٠) وشتریشیان دانا بۆ ئەوکەسەی بەم کارە هەستێ.

* خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراست لەو هەوڵەی قورەیشیەکان و ئاگاداری کردەوە لەوەها هەوڵێك. پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر دەرچوون بە ئاڕاستەی ئەشکەوتی سەور.

* پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر (٣) ڕۆژ لەو ئەشکەوتە مانەوە و خۆیان حەشاردابوو. ئەسمائی کچی ئەبوبەکر خواردنی بۆ دەهێنان.

* کافرانی قورەیش هەموو شوێنێ گەڕان بۆ پێغەمبەرﷺ. بەڵام نەیاندۆزیەوە. هەندێکیان بەرەو ئەشکەوتی سەور هاتن و لەسەری وەستان.

* ئەگەر یەکێك لەو کافرانە سەیری خوارەوەی بکردایە پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکری دەبینی، بەڵام خوا ویستی لەسەر نەبوو، کەسیان سەیری خوارەوەیان نەکرد.

* ڕیوایەتی چنینی ماڵی عەنکەبوت و هێلانەی کۆتر لاوازە و پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەی هێناویەتی بە سەنەدێکی لاواز.

* پاشان ئەو کافرانەی قورەیش گەڕانەوە و خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پاراست .

* پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکری سدیق دوای (٣) ڕۆژ مانەوە لە ئەشکەوتەکە دەرچوون و بەڕێکەوتن بەرەو مەدینە.

* عامری کوڕی فوهەیرە لەگەڵیان دەرچوو بۆ ئەوەی خزمەتیان بکا. عامری کوڕی فوهەیرە ئازادکراوی ئەبوبەکر بوو.

* ڕێپیشاندەریان بەرەو مەدینە عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیط بوو. هێشتا باوەڕیشی نەهێنابوو.

* پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکری سدیق و عامری کوڕی فوهەیرە وعەبدوڵای کوڕی ئورەیقیط لە ڕێگادابوون بەرەو مەدینە کۆمەڵێ ڕووداو ڕوویاندا.

* لەو ڕووداوانە: چیرۆکی سوڕاقەی کوڕی مالك و موسڵمان بوونی شوانەکە و چیرۆکی ئوم مەعبەدی خوزاعی و چاوپێکەوتنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر کە لە شامەوە دەهاتن.

* لەو ڕووداوانەی کە باسدەکرێن و جێگیر نەبوون و لاوازن، چیرۆکی سوڕاقەی کوڕی مالکە گوایە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە چۆن دەبێ ئەوکاتەی بازنەکانی کیسرا لەدەست دەکەی.

* پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە (١٢)ی ڕەبیع ولئەوەلی ساڵی (١٤)ی پێغەمبەرایەتی دا گەشتنە قوباء بە پاراستنی خوای گەورە. کە دەکاتە ساڵی یەکەمی کۆچی .

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە قوباء بینی ئەنسارییەکان لەپێشوازیدان، پێغەمبەر ﷺ (١٤) شەو لە قوباء مایەوە.

* پێغەمبەر ﷺ لەم ماوەیەدا مزگەوتی قوبائی بنیاتنا.

* کاتێ ڕۆژی جومعە هات، پێغەمبەر ﷺ سواری وشترەکەی بوو، ئەبوبەکریش لە پشتییەوە، کەوتنەڕێ بەرەو مەدینە .

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە خاکی بەنی سالمی کوڕی عەوف و کاتی نوێژی جومعە هات.

* پێغەمبەر ﷺ نوێژی جومعەی کرد لە دۆڵی ڕانوناء، ئەمەش یەکەمین نوێژی جومعە بوو لە ئیسلامدا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ کەوتەڕێ بەرەو مەدینە و ڕۆشتە ناو مەدینەوە لە کەشێکی پڕ لەخۆشی و شادیدا.

* ڕۆژێکی گەورە و مێژوویی بوو، هەموو ماڵ و گەڕەك و بازاڕ دەلەریەوە بەدەنگی الحمد لله و الله أکبر .

* ئەنەس ئەفەرموێ: هیچ ڕۆژێکی ڕووناکتر و جوانترم نەبینیوە وەك ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر هاتنە ناو مەدینەوە.

* بەراء ( ڕەزای خوای لێبێ ) ئەفەرموێ: نەمبینیوە خەڵکی مەدینە بەهیچ شتێ دڵیان خۆش بووبێ، وەك دڵخۆشیان لەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو مەدینەوە.

* هەروەها ئەفەرموێ: ژنان و پیاوان سەرکەوتنە سەربانی خانوەکان و منداڵ و خزمەتکارەکان بڵاوەیان کرد بەنێو ڕێگاکاندا و هاواریان دەکرد: ئەی محمد ئەی پێغەمبەری خوا .

* ئەنەس ( ڕەزای خوای لێبێ ) ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەرﷺ هاتە ناو مەدینەوە هەموو شتێکی ناو مەدینە ڕووناك بووەوە.

* ئەنەس ( ڕەزای خوای لێبێ ) ئەفەرموێ: کچە بچکۆلەکان بەدەف لێدانەوە دەرچوون و دەیانوت:

ئێمە کچانی بەنی نەجارین خۆزگەمان بە دراوسێیەتی پێغەمبەرﷺ .

* بەیتە ناودارەکان: طلع البدر علينا ( بەیهەقی بە سەنەدێکی لاواز گێڕاویەتیەوە) .

* غەزالی لە ئیحیائەکەیدا هێناویەتی و حافزی عێراقی ئەفەرموێ سەنەدەکەی موعزەلە. هەروەها ئیبنولحەجەر بەلاوازی داناوە لە فەتحدا و هەروەها ئیبنولقەییمیش بەلاوازی داناوە لە زادولمیعاددا.

* وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ لە شوێنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت، ئەم هەڵبژاردنەش بە فەرمانی خوابوو، چونکە شوێنی وشترەکە کرا بە مزگەوت.

* پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی ئەبوئەییوبی ئەنساڕی دانیشت و بووە میوان (ڕەزای خوای لێبێ). تاوەکو ژوورەکانی تەواوکرا بەتەنیشتی مزگەوتەکەیەوە.

* ئەبوئەییوبیش گەورەترین شەرەفی بەرکەوت بە میوانداری کردنی پێغەمبەرﷺ.

* مەدینە ناسرابوو بە نەخۆشی، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تووشی بەڵا و نەخۆشی بوون، بەڵام خوا پێغەمبەرەکەی پاراست .

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ بەڵا و نەخۆشی بینی بە هاوەڵانیەوە، داوای کرد لەخوا کە بەڵا و نەخۆشی لەسەر مەدینە هەڵگرێ.

* پێغەمبەر ﷺ فەرموی : خوایەگیان مەدینەمان لا خۆشەویست بکە وەکو خۆشەویستیمان بۆ مەککە بەڵکو زیاتریش، لە بەڵاو نەخۆشی بیپارێزە و بەرەکەت بخەرە ساع و مود مانەوە.

# کۆمەڵگای مەدینە



* پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگاکەی لەسەر سێ بنەما بنیاتنا:

١- بنیاتنانی مزگەوتەکەی.

٢- برایەتیکردنی نێوان موهاجرین و ئەنسار .

٣- نوسینی سەحیفە(دەستوری مەدینە). کە ئەو سەحیفەیە بوو پێغەمبەر ﷺ نوسیبوی بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان موسڵمانان لەلایەك و، لەلایەکی ترەوە ڕێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو هۆزانەی کە دراوسێی مەدینەن بەتایبەتی هۆزەکانی جولەکە .



* لە مانگی شەوالی ساڵی یەکەمی کۆچیدا، پێغەمبەر ﷺ دایکە عائیشەی گواستەوە.

* عائشە ( ڕەزای خوای لێبێ ) خۆشەویستترین خێزانی پێغەمبەر بوو.

* پێغەمبەر ﷺ ناوی یەسریبی گۆڕی بۆ مەدینە،طابة، طیبة.

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (خوای گەورە ناوی مەدینەی ناوە بە طابة). ( مسلم گێڕاویەتیەوە ).



* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ (: فەرمانم پێکراوە کۆچ بکەم بۆ شارێك کە شارەکانی تر دەخوات و پێی دەوترێ یەسریب کە مەدینەیە). ( شەیخەین گێڕاویانەتەوە ).

* جابری کوڕی سەمورە ( ڕەزای خوای لێبێ ) فەرمویەتی :(پێشتر بە مەدینەیان دەوت یەسریب، پێغەمبەر ﷺ ناوی نا طیبة).

* بانگدان لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا بووە دروشم و شەرع.

* ئەو ڕیوایەتانەی دەڵێن پێش کۆچ کردن یان لەکاتی ئیسرا بووە، جێگیر نەبووە و لاوازە.

* عبدالله ی کوڕی سەلام لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا موسوڵمان بوو (ڕەزای خوای لێبێ).

* عبدالله ی کوڕی سەلام لە زانایانی جولەکە بوو، موسڵمان بوونی عبدالله حوججە بوو لەسەر جولەکە.

* کاتێ موهاجیرین هاتنە مەدینە، ئاوی مەدینەیان لا سازگار نەبوو.

* پیاوێ لە بەنی غیففار کانیەکی هەبوو پێی دەوترا ڕومە.

* کونئەیە ئاوی دەفرۆشت بە مودێ ( مشتێ ) خواردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ بیری ڕومە ئەکڕێ بەخێرێ بۆی لە بەهەشت.

* عوسمانی کوڕی عەفان ( ڕەزای خوای لێبێ ) بە پارەی تایبەتی خۆی کڕی و کردی بە وەقف بۆ موسڵمانان.

* کاتێ پێنج نوێژەکە لەئیسرا و میعراج فەرزکرا هەموو نوێژەکان دوورکات دوورکات بوو، جگە لە نوێژی مەغریب سێ ڕکات بوو.

* لە مەدینە وەحی دابەزی بە زیادکردنی نوێژەکانی تر بۆ چوار چوار و ئیتر هەروا مایەوە .

* بەڵام وەکو ئاسانکارییەك لەکاتی سەفەردا نوێژە چواریەکان کورت دەکرێنەوە بۆ دوو دوو. ( وەرگێڕ)

* بەنو سەلیمە ویستیان شوێنەکانی خۆیان چوڵبکەن (لە دەوروبەری مەدینە بوون، دووربون لە مزگەوتی پێغەمبەرەوە) بۆئەوەی نزیك ببنەوە لە مزگەوتەکە.

-پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی بەنی سەلیمە شوێن پێکانتان بەپاداشت بۆتان ئەژمێردرێ "یانی نەهی لێکردن شوێنەکانی خۆیان چۆڵ بکەن.

* ئەوانیش لەشوێنی خۆیان مانەوە و چۆڵیان نەکرد.

# مۆڵەتی جیهاد و

# چالاکییە سەربازییەکان



* کاتێ پێغەمبەر ﷺ تەواو جێگیر بوو لە مەدینە. وەحی دابەزی بە شەرعاندنی جیهاد. ( أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا).

* غەزوە هەر سریەیەکە خودی پێغەمبەر ﷺ دەرچوبێ لەگەڵیدا جا شەڕ روویدابێ یان نا پێی دەوترێ غەزا.

* پێغەمبەر ﷺ (٢١) غەزای کردوە. یەکەمیان غەزای ئەبوا یان وەددان بووە و کۆتا غەزاشی غەزای تەبوك بوو.



* یەکەمین سریە پێغەمبەر ﷺ ناردی بە سەرۆکایەتی حەمزەی کوڕی عەبدلموتەلیب بوو ( ڕەزای خوای لێبێ ) بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قوڕەیش.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ئامۆزاکەی نارد عوبەیدەی کوڕی حارسی کوڕی عەبدلموتەلیب بە سریەیەکەوە بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قوڕەیش و. شەڕ ڕوویدا لەنێوانیاندا دووراو دوور بەتیر.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسی نارد بەسریەیەکەوە بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قورەیش، بەڵام کاروانەکە هەڵهاتن.

* لەدوای کۆچی موسڵمانان بۆ مەدینە، یەکەمین کەس کۆچی دوایی کرد کلسومی کوڕی هیدم بوو (ڕەزای خوای لێبێ)، پیاوێکی بەساڵاچوو بوو.

* لەمانگی سەفەر و لەسەری (١٢) مانگی کۆچ کردن، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ یەکەمین غەزا، ئەویش غەزای (ئەبوا) یا (وەدان) بوو، بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قورەیش .

* پاشان پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی سەری ١٣ مانگی کۆچ کردن دەرچوو بۆ دووەم غەزای، ئەویش غەزای بەوات بوو، بۆ ڕێگریکردن بوو لە کاروانی بازرگانی قورەیش.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ سێیەمین غەزای، ئەویش غەزای عوشەیرە بوو.

* لەمانگی جەمادولئولا بوو لەسەری ١٦ مانگی کۆچ کردنی.

* چەند شەوێ پاش ئەم غەزایە، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ غەزای سەفوان، هەروەها پێیشی ئەوترێ غەزای یەکەمی بەدر.

* پێغەمبەر ﷺ عبداللە ی کوڕی جەحشی نارد بەسریەیەکەوە بۆ ناوچەی نەخلە، بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قورەیش.

* گەشتن بە کاروانەکە وعەمری کوڕی حەزرەمی کوژرا کە ئەمە یەکەمین کوژراوی کافرانە لە مێژووی ئیسلام دا.

* هەروەها عوسمانی کوڕی عبدالله و حەکەمی کوڕی کەیسان بەدیل گیران و هەموو کاروانەکە بەدەسکەوت (غەنیمە) دەستی بەسەردا گیرا.

* لەسریەکەی نەخلە بەسەرۆکایەتی عبداللەی کوڕی جەحش یەکەمین کوژراو و یەکەمین دیل و یەکەمین دەسکەوت بۆ ئیسلام ڕوویاندا.

* لە نیوەی مانگی ڕەجەبی ساڵی (٢)ی کۆچی وەحی دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە قیبلە لە مزگەوتی ئەقساوە بگۆڕێ بۆ کەعبەی شەرەفمەند.

* لەمانگی شەعبانی ساڵی (٢)ی کۆچی وەحی دابەزی بۆ پێغەمبەر ﷺ بە فەرزبوونی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان.

* پێغەمبەر ﷺ (٩) ساڵی لەسەریەك ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی گرت. لەبەرئەوەی لە سەرەتای ساڵی (١١)ی کۆچی وەفاتی کرد.

* لەهەمان مانگ و هەمان ساڵ زەکاتی فیتر ( سەرفترە ) فەرزبوو لەسەر موسڵمانان.

* لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٢)ی کۆچی غەزای بەدری گەورە ڕوویدا. کە بریتیە لەو ڕۆژەی خوا بەهۆیەوە جیاوازی خستە نێوان حەق و باتڵەوە.

* غەزای بەدری گەورە خوای گەورە باسەکەی گێڕاوەتەوە تا قیامەت لە قورئانەکەی و تایبەتمەندی کردوە بە چەندین تایبەتمەندی کە لە هیچ غەزایەکی تردا نەبووە.

* ئەو هاوەڵانەی لەم غەزایە بەشداربون باشترینی هاوەڵانن.

* لە غەزای بەدری گەورەدا. خوا پێغەمبەرەکەی سەرخست بە سەرخستنێکی گەورە و بەهێز. هەروەها زیاتر بەهێزبوون و پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش بوو.

* ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ ڕاستەوخۆ دوای غەزای بەدری گەورە کۆچی دوایی کرد .

* ڕوقیە ( ڕەزای خوای لێبێ) خێزانی عوسمانی کوڕی عەفان بوو. منداڵێکیشی لێبوو بەناوی عبدالله. بەڵام ئەویش هەر بەمنداڵی وەفاتی کرد.

* موسڵمانان یەکەمین جەژنی ڕەمەزانییان بەڕێکرد لە (١)ی شەوالی ساڵی (٢)ی کۆچی .

* لە ساڵی (٢)ی کۆچی عەلی فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواست ( ڕەزای خوایان لێبێ ) .

* عەلی لە فاتیمە هەریەکە لە:

حەسەن و حوسەین و موحەسین و ئوم کولسوم و زەینەبی بوو ( ڕەزای خوا لەهەموویان بێ ).

* لە شەوالی ساڵی (٢)ی کۆچی غەزای بەنو قەینوقاع ڕوویدا.

* پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی دان و دواتر لە مەدینە وەدەری نان.

* لە مانگی زیلحیجەی ساڵی (٢)ی کۆچی غەزای ئەسەویق ڕوویدا

* ئەبوسوفیان دای بەسەر مەدینەدا و پیاوێکی لە ئەنسار کوشت.

* پێغەمبەر ﷺ بە (٢٠٠) کەسەوە بۆی دەرچوو .

* له (١٠)ی زیلحیجەی ساڵی (٢)ی کۆچی موسڵمانان یەکەمین جەژنی قوربانیان بەڕێکرد و پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی کردە قوربانی.

* هەر لە زیلحیجەی ساڵی (٢)ی کۆچی عوسمانی کوڕی مەظعون کۆچی دوایی کرد و پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەرکرد و لە گۆڕستانی بەقیع نێژرا، ئەمەش یەکەمین مردووی موهاجرین بوو کە لە بەقیع نێژرا .

* لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (٣)ی کۆچی غەزای بەنی سولەیم ڕوویدا، پێشی ئەوتری غەزای قەرقەرەتولکودر.

* پێغەمبەر ﷺ بە (٢٠٠) کەسەوە دەرچوو کاتێ هەواڵی زانی کە بەنو سولەیم بۆی کۆبونەتەوە.

* لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (٣)ی کۆچی غەزای ذی ئەمر ڕوویدا پێشی ئەوترێ غەزای غەتەفان.

* پێغەمبەر ﷺ بە (٤٥٠) کەسەوە دەرچوو بۆیان، کاتێ هەواڵی زانی کە غەتەفان بۆی کۆبونەتەوە.

* لە مانگی جەمادولئاخیری ساڵی (٣)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد بەسەرۆکایەتی زەیدی کوڕی حاریثە بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قوڕەیش.

* سریەکە گەشت بەکاروانەکە و هەموویان وەکو دەسکەوت (غەنیمە) دەستبەسەرگرت.

* له مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (٣)ی کۆچی عوسمانی کوڕی عەففان ئوم کلسومی کچی پێغەمبەری خواست، دوای وەفاتی ڕوقیەی خوشکی ( ڕەزای خوایان لێبێ ).

* عوسمان هیچ منداڵی له ئوم کلسوم نەبوو.

* له مانگی شەعبانی ساڵی (٣)ی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ حەفسەی کچی عومەری خواست که پێشتر خێزانی خونەیسی کوڕی حوزافه بوو. وەفاتی کردبوو ( ڕەزای خوا له هەموویان بێ).

* له مانگی ڕەمەزان پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی خواست، بەڵام دوای(٢ یا ٣) مانگ لەمانەوەی لای پێغەمبەرﷺ کۆچی دوایی کرد ( ڕەزای خوای لێبێ).

* له نیوەی شەوالی ساڵی (٣)ی کۆچی غەزای ئوحود ڕوویدا.

* غەزای ئوحود بەیەکێك لەناڕەحەتترینی غەزاکان دادەنرێ که بەسەر پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان دا هات.

* پێغەمبەر ﷺ دانەکانی پێشەوەی شکێنرا و سەری موبارەکی بریندار‌بوو، خوای گەورە بە فریشته پاراستی.

* غەزای ئوحود تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆ موسڵمانان لەڕووی بەرگریکردنیان له پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتوش بوون لەم تاقیکردنەوەیە.

* له غەزای ئوحود (٧٠) هاوەڵ شەهیدبوون (ڕەزای خوایان لێبێ). لەسەرووی هەموویانەوە حەمزەی مام و برای شیری پێغەمبەر ﷺ

* له غەزای ئوحود دا خۆشەویستی ڕاستەقینەی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت، گیانی خۆیان کردە قوربانی بۆ پاراستنی پێغەمبەر ﷺ.

* غەزای ئوحود تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینە بوو. تیایدا باوەڕدارە ڕاستگۆکان دەرکەوتن کە هاوەڵانن و مونافیقە درۆزنەکانیش دەرکەوتن کە مونافیقەکان بوون، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئیبنو سەلول.

* له غەزای ئوحود ئەبودوجانە شمشێرەکەی پێغەمبەری برد و وەفای پێی هەبوو.

* فریشتە دابەزیە مەیدانی جەنگەکە بۆ یارمەتیدانی موسڵمانان و حەنزەلەی کوڕی ئەبو عامریان شوشت.

* غەزای ئوحود وەکو ئامادەکاری و سەرەتایەك بوو بۆ وەفاتی پێغەمبەر ﷺ. خوای گەورە هاوەڵانی دامەزراند لەسەری ( ڕەزای خوایان لێبێ) .

* غەزای ئوحود کۆمەڵێ پەند و وانەی گەورە گەورەی تێدایە، ئیبنولقەییم ( ڕەحمەتی خوای لێبێ ) بەجوانی لە زادولمیعادەکەیدا ئەو پەند و وانانەی هەڵگۆزیوە.

* له مانگی موحەڕەمی ساڵی (٤)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەبوسەلەمەی بە (٥٠) کەسەوە نارده سەر تولەیحەی کوڕی خوەیلد.

* تولەیحەی کوڕی خوەیلد خەڵکی کۆکردبویەوە بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە.

* کاتێ ئەبوسەلەمە لەم ئەرکە گەڕایەوە. برینەکەی کە لە غەزای ئوحوددا توشی بوو بوو کولایەوە و بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خوای لێبێ ).

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (خوایە لە ئەبوسەلەمە خۆش بەو پلەی بەرزبکەرەوە لەنێو ڕێنیشاندراوان و شوێنی پڕبکەرەوە لەوانەی ماونەتەوە لەدوای خۆی. لە ئێمە و لە ئەویش خۆش ببە ئەی خوای جیهانیان).

* له مانگی موحەڕەمی ساڵی (٤)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ عبدالله ی کوڕی ئونەیسی نارد بۆ کوشتنی خالدی کوڕی سوفیانی هوزەلی.

* خالدی کوڕی سوفیان خەڵکێکی زۆری کۆکردبویەوە بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە.

* عبداللهجی کوڕی ئونەیس توانی خالدی کوڕی سوفیانی هوزەلی بکوژێت. بەمەش ئەو خەڵکەی کۆیکردبووەوە بڵاوەیان لێکرد.

* کاتێ عبدالله ی کوڕی ئونەیس گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ زۆر دلخۆشبوو و پێی فەرموو: (ڕووت سەرفراز بێت).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ گۆچان ( داردەست )ەکەی خۆی پێبەخشی وەکو نیشانەیەك لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و عبدالله دا.

* عبدالله ی کوڕی ئونەیس کاتێ وەفاتیکرد گۆچانەکەشیان لەگەڵدا ناشت

* له مانگی سەفەری ساڵی (٤)ی کۆچی سریەی ڕەجیع دەرچوون. (١٠) لەهاوەڵان بوونە قوربانی، چونکە بەنولەحیان ناپاکی (غەدر) یان لێکردن.

* ئەم ڕووداوە زۆر قورس بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ.

* له مانگی سەفەری ساڵی (٤)ی کۆچی ڕووداوە دڵتەزێنەکەی بیری مەعونە، یان سریەی قورئان خوێنان ڕوویدا.

* (٧٠) له هاوەڵان بوونە قوربانی چونکە هۆزەکانی رەعل و زەکوان و عوسەیە ناپاکی (غەدر) یان کرد لێیان.

* ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە یەکێك بوو له نارەحەتیە گەورەکانی موسڵمانان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ماوەی یەك مانگی تەواو له نوێژدا دوعای قونوتی دەخوێند و دوعای دەکرد لەو هۆزانەی ناپاکیان کرد بەرامبەر هاوەڵەکانی.

* له مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (٤)ی کۆچی غەزای بەنی نەزیر ڕوویدا.

* ئەمەش غەزای دووەمە لەگەڵ جولەکە دا. هۆکارەکەیشی ئەوەبوو ویستیان پێغەمبەر ﷺ بکوژن (تیرۆری بکەن).

* پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆیان و گەمارۆی دان، خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە و دواتر ڕێککەوتن لەسەر دەرچوون و جێهێشتنی شوێنەکانی خۆیان.

* مانای جێهێشتنی شوێن ئەوەیە خاکەکە چۆڵبکەن، پێغەمبەر ﷺ بەمەرجی دانا هەرچی دەتوانن لە شمەك هەڵیبگرن و بیبەن جگە لە چەك.

* سورەتی حەشر بەتەواوی لەسەر ئەم غەزایە دابەزی و بەوردی باسی ئەم ڕووداوە دەکات.

* بەجوانی لە ئایەتەکانی ئەم سورەتە تێناگەی تاوەکو بەسەرهاتی (عەزاکە) نەخوێنیتەوە.

* لە مانگی شەعبانی ساڵی (٤)ی کۆچی دا غەزای بەدری دووەم ڕوویدا، پێشی ئەوترێ بەدری بچووك، لەبەرئەوەی شەڕ ڕووی نەدا.

* هەروەها غەزای بەدری بەڵێنیشی پێ ئەوترێ، لەبەرئەوەی ئەبوسوفیان بەڵێنی دا بە پێغەمبەر ﷺ، لەدوای غەزای ئوحود بە غەزایەکی تر و پێکگەیشتنێکی تر لە ساڵی داهاتوودا لە بەدر.

* پێغەمبەر ﷺ بە (١٥٠٠) کەسەوە دەرچوون و ئەبوسوفیان یش بە (٢٠٠٠) کەسەوە، بەڵام بەترس و شلەژاویەوە.

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە بەدر و چاوەڕێی ئەبوسوفیانی دەکرد، کاتێ ئەبوسوفیان گەشتە عوسفان ترسا و خوای گەورەش ترسی خستە دڵیەوە و گەڕایەوە.

* له مانگی شەوالی ساڵی (٤)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئوموسەلەمەی خواست، کە ناوی هندی کچی ئەبوئومەیەی کوڕی موغیرەیە. ئەویش دوای تەواوبوونی عیدەکەی.

* ئوموسەلەمە بەژنێکی خاوەن عەقڵێکی گەورە و بۆچوونی دروست وەسفکراوبوو.

* کۆتا خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو کۆچی دوایی بکات. لە ساڵی (٦١)ی کۆچی وەفاتی کرد (ڕەزای خوای لێبێ).

* پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی خواست. لە ساڵی (٤)ی کۆچی، کە پێشتر خێزانی زەیدی کوڕی حاریثە بوو.

* مەبەست لە خواستنی دایکە زەینەب لە لایەن پێغەمبەرەوە، پوچکردنەوەی نەریتی بەمنداڵکردن (تەبەنی) بوو چونکە زەیدی کوڕی حاریثە، کوڕی پێغەمبەربوو بەتەبەنی پێش ئەوەی خوا نەهی لێبکات.

* زەینەبی کچی جەحش ماوەی ساڵێ لای زەیدی کوڕی حاریثە مایەوە ڕەزای خوایان لێبێ، پاشان تەڵاقی داو، پاش تەواوبوونی عیدەکەی پێغەمبەر ﷺ خواستی.

* ئەوەی زەینەبی مارەکرد لە پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەبێ مۆڵەت چووە ژوورەوە بۆلای.

* خوای گەورە ئەفەرموێ: {کاتێ کە زەید خواستی و بوو بە هاوسەری پاشان ڕێک نەکەوتن و جیابوونەوە و تەڵاق کەوتە نێوانیان، ئێمە ( زەینەب ) مان لە تۆ مارەگرد}.

* زەینەبیش شانازی بەوەوە دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەرەوە و دەیوت: (ئێوە کەسوکارەکانتان بە شوویان داون، بەڵام من خوای گەورە لەسەروی حەوت چینی ئاسمانەوە).

* پێغەمبەر ﷺ وەلیمەی سازکرد بۆ گواستنەوەی زەینەب. ئەنەس ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ زەینەبی گواستەوە وەلیمەی سازکرد و، خەڵکی تێر نان و گۆشت کرد.

* لە چیرۆکی گواستنەوەی زەینەب ئایەتی حیجاب دابەزی.

مەبەست لێی ئەوەبوو کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەڵکی نامەحرەم قسە نەکەن، مەگەر لەپشتی پەردە و حیجابەوە نەبێت.

* زەینەبی کچی جەحش ( ڕەزای خوای لێبێ ) یەکێك بوو لە باشترین ژنە زۆر خواپەرست و ديندار و دونیا نەویست و بەخشندەکان.

* عائیشە دەربارەی ئەفەرموێ: هیچ ژنێکی وەکو زەینەب دیندارم نەبینیوە.

* پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکانی فەرموو: ئەوەتان زیاتر دەستی درێژبێ زووتر پێمدەگات.

مەبەست لەدەستی درێژ بەخشینە* جا زەینەب لەهەموویان زیاتر بەخشندەتر بوو.

* زەینەب ( ڕەزای خوای لێبێ ) لە ساڵی (٢٠) ی کۆچی وەفاتی کرد لە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب، یەکەمین خێزانی پێغەمبەر بوو دوای خۆی وەفاتی کرد.

* له مانگی شەعبانی ساڵی (٥)ی کۆچی غەزای بەنی لموستەلەق ڕوویدا، پێیشی ئەوترێ مورەیسیع.

هۆکارەکەیشی کۆکردنەوەی خەڵکی بوو، بە مەبەستی هێرشکردنە سەر مەدینە، لەلایەن حارسی کوڕی ئەبو زیرار.

* پێغەمبەر ﷺ بە (٧٠٠) کەسەوە دەرچوو بۆیان و سەرکەوت بەسەریاندا.

* لەناو کەنیزەکەکاندا جومەیریەی کچی حارسی کچی گەورەی بەنی لموستەلەق هەبوو.

* پێغەمبەر ﷺ بانگیکرد بۆ باوەڕهێنان و داخوازیشی کرد. موسڵمان بوو، پێغەمبەریش خواستی.

* هەرکە جومەیریە بووە خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئیدی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێ هەموو کۆیلەکانیان ئازادکرد، چوون بوون بەخەزور و خزمی پێغەمبەر ﷺ .

* عائیشە دەربارەی ئەفەرموێ: نازانم هیچ ژنێك بە ئەندازەی جومەیریە بووبێتە بەرەکەت بۆ قەومەکەی.

* دایکی باوەڕداران جومەیریە ( ڕەزای خوای لێبێ ) ئافرەتێك بوو زۆر یادی خوای ئەکرد، ساڵی (٥٦) ی کۆچی وەفاتی کرد لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا.

※ ژمارەیەکی زۆر لە موونافیقەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون بۆ غەزای بەنی لموستەلەق بۆ نانەوەی ئاژاوە و ئاشوب لە نێو موسڵمانان.

※ دوو ڕووداوی زۆر گەورە لەم غەزایەدا ڕوویاندا:

١- نانەوەی ئاژاوەو ئاشوب لە نێوان موهاجرین و ئەنسار.

٢- ڕووداوی بوختانەکە بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە( ڕەزای خوای لێبێ ).

※ عەبدوڵای کوڕی سەلول و هاوڕێ موونافیقەکانی هەوڵیاندا تانە لە شەرەفی دایکە عائیشە بدەن. بەڕاستی فیتنەیەکی گەورە بوو.

※ خوای گەورە لە سەرووی حەوت چینی ئاسمانەوە پاکێتی دایکە عائیشەی ڕاگەیاند و، (١٠) ئایەتی لەسەری دابەزاند کەتا قیامەت بخوێنرێتەوە.

※ پاکێتی دایکە عائیشە بەقورئانی پیرۆز سەلمێنراوە. هەرکەسێ گومانی لێی هەبێ کافر دەبێتەوە بە کۆڕای زانایان.

※ لەڕووداوی بوختانەکە کۆمەڵێ پەند و وانەی گەورە گەورەی تێدایە. ئیبنولحجەری عەسقەلانی زیاتر لە (٧٠) پەند و وانەی هەڵگۆزیوە.

※ لە مانگی شەوالی ساڵی (٥)ی کۆچی غەزای خەندەق ڕوویدا. پێیشی ئەوترێ غەزای ئەحزاب.

※ جولەکە هانی هۆزەکانی عەرەبیدا بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە.

※ (١٠) هەزار لە هۆز و ئەحزابەکان کۆبوونەوە و جولەکەیش هانیدەدان بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە.

※ سەرکردەی ئەحزاب ئەبوسوفیان، سەخری کوڕی حەرب بوو

* سەلمانی فارسی ( ڕەزای خوای لێبێ ) پێشنیاری هەڵکەندنی خەندەق (چاڵ) ەکەی کرد. پێغەمبەریش پێشنیارەکەی پەسەندکرد.

* غەزای خەندەق یەکەمین غەزا بوو سەلمانی فارسی بەشداری تێدا کرد.

* ژمارەی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ (٣) هەزار کەسبوو. پێغەمبەر ﷺ بۆ هەر (١٠) کەس و سەرکردەیەکی دانابوو. دووری(٤٠) باڵی دانابوو بۆ ئەوەی هەڵیبکەنن.

* پێش گەیشتنی سوپای ئەحزاب خەندەقەکە تەواوبوو. کاتێ ئەحزاب گەیشتن بینیان خەندەقەکە ڕێگرە لەوەی بڕۆنە ناو مەدینەوە.

* لە غەزای خەندەقدا کۆمەڵێ موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوتن لەوانە: زۆربوونی خواردنی کەم و شکاندنی بەردی گەورە بە (٣) لێدان و موژدەدان بە فەتحکردنی فارس و ڕۆم.

* جولەکەی بەنی قورەیزە پەیمانەکەیان شکاند لەگەڵ موسڵمانان. بارودۆخەکە قورستر بوو لەسەر موسڵمانان و زیاتر نارەحەت بوون و دڵەکان گەشتبوونە قوڕگەکان.

* پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە لەخوای گەورە بۆئەوەی بەهانایانەوە بێت. خوای گەورە وەڵامی دایەوە و بایەکی توند هەڵیکرد و فریشتەیش دابەزی بۆ ترس خستنە ناو دڵی کافرەکانەوە.

* ئەحزاب بە نائومێدی گەڕانەوە شوێنانی خۆیان و ئاسایش و دڵنیایی گەڕایەوە بۆ مەدینەی پێغەمبەر ﷺ. پاش ئەوەی خوا پەرتەوازەی کردن بە بایەکی توند و ترسی خستنە ناو دڵیانەوە.

* پێغەمبەر ﷺ دوای غەزای خەندەق گەڕایەوە ماڵی خۆی وجبریل (علیه السلام) هات و فەرمانی پێکرد بەهێرشکردنە سەر جولەکەی بەنی قورەیزە.

* پێغەمبەر ﷺ جلی سەربازی کردەوە بەری و هاتەدەرەوە بۆلای هاوەڵەکانی و فەرمووی: هەرکەسێ باوەڕی هەیە بەخوا و بە ڕۆژی دوایی با نوێژی عەسر نەکات مەگەر لە بەنی قورەیزە نەبێت.

* پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ سەر بەنی قورەیزە و گەمارۆی دان بارودۆخەکە سەخت بوو لەسەریان و خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە و هەموویان خۆیان بەدەستەوە دا.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد پیاوەکانیان ببەسترێنەوە. کە ژمارەیان (٤٠٠) کەس بوون. حوکمەکەی جێهێشت بۆ سەعدی کوڕی موعاز ( ڕەزای خوای لێبێ ).

* سەعدی کوڕی موعازیان بەسواری گوێدرێژێکەوە هێنا. لە غەزای خەندەق بریندار بوو بوو.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حوکمی بەنی قورەیزەم خستۆتە دەستی تۆ.

* سەعد فەرمووی: حوکم ئەدەم بەوەی شەڕکەریان بکوژرێ و ژن و مناڵیان بەکۆیلە بکرێن و، ماڵیشیان دابەش بکرێ لە نێو موسڵمانان.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( واللە حوکمت کرد بەحوکمی خوای گەورە لە سەروی حەوت چینی ئاسمانەوە).

پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستیکرد بە جێبەجێکردنی بڕیارەکەی سەعد .

* دوای ئەوەی حوکمی سەعدی کوڕی موعاز جێبەجێکرا بەسەر جولەکەکانی بەنی قورەیزە. برینەکەی هەڵیدایەوە و بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد ( ڕەزای خوای لێبێ ).

* کاتێ سەعدی کوڕی موعاز وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (عەرشی خوا بەهۆی مردنی سەعدەوە لەریەوە). (شەیخەین گێڕاویانەتەوە)

* لەکاتی گواستنەوەی تەرمی سەعد فریشتەکانیش بەشدارییان کرد لە هەڵگرتنی تەرمەکەی.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەو ڕۆژەی سەعد وەفاتی کرد (٧٠) هەزار فریشتە دابەزینە سەرزەوی پێشتر دانەبەزیبون). ( بەزار بەسەنەدێکی حەسەن گێڕاویەتیەوە )

* هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) هەموویان دڵتەنگبوون بە کۆچی دوایی سەعد. هەتا ئەبوبەکر و عومەر ( ڕەزای خوایان لێبێ) بۆی گریان.

* عائیشە دەربارەی ئەفەرموێ: لە دەستدانی کەس دوای پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر. وەکو سەعد بە ئازار نەبوو بۆ موسڵمانان.

* خوای گەورە باسی غەزای خەندەقی هێشتەوە تا قیامەت لە قورئانەکەیدا سورەتێکی دابەزاند بەناوی سورەتی ئەحزاب.

* پێغەمبەر ﷺ زنجیرەیە هەڵمەتی تەمێکردنی دەستپێکرد بۆ سەر ئەو هۆزانەی کە بەشداربوون لە غەزای خەندەق. سریە لەدوای سریەی دەنارده سەریان.

* لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (٦)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ غەزای بەنی لەحیان وهێرشی کرده سەریان و بڵاوەی پێکردن.

* لە هەمان مانگ و هەمان ساڵ پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد بە سەرۆکایەتی عوکاشەی کوڕی میحسەن بۆ سەر بەنی ئەسەد. ئەوانیش هەڵهاتن و بڵاوەیان کرد.

* پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد بە سەرۆکایەتی محمدی کوڕی مەسلەمە بۆ سەر بەنی سەعلەبە لە غەتەفان و شەڕ ڕوویدا لە نێوانیان. ئەمەش لە مانگی ڕەبیعولئاخری ساڵی (٦)ی کۆچی .

* لە هەمان مانگ و هەمان ساڵ پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی تری نارد بە سەرۆکایەتی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح بۆ سەر زیلقەسە. دەی بەسەریاندا و غەنیمەیشی لێ وەدەسکەوت.

* لە هەمان مانگ و هەمان ساڵ پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد بە سەرۆکایەتی زەیدی کوڕی حاریثە بۆ سەر بەنی سولەیم. غەنیمەتی لێ وەدەسخستن و هەموویان بەسەلامەتی گەڕانەوە.

* له مانگی جەمادولئەولی ساڵی (٦)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ سریەیەکی نارد بەسەرۆکایەتی زەیدی کوڕی حاریثە بۆ ڕێگریکردن لە کاروانی بازرگانی قوڕەیش.

* گەشتن بەکاروانەکە و هەموویان بەدیل گرتن و دەستیان گرت بەسەر هەموو کاروانەکەدا.

* لەناو دیلەکاندا ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیع مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەر هەبوو، هێشتا باوەڕی نەهێنابوو.

* زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ داڵدەی مێردەکەیدا، پێغەمبەریش دیلەکانی تری ئازاد کرد و ماڵەکەی ئەبولعاسییان گەڕاندەوە.

* ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیع گەڕایەوە مەککە و ئەو ماڵانەی خەڵکی مەککە لەناو کاروانە گیراوەکەبوو گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکانیان و پاشان خۆیشی باوەڕی هێنا، پاشان کۆچی کرد بۆ مەدینە.

# یەکەمین عومرەی پێغەمبەر ﷺ و سەرەتای فەتحی مەککە



* لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٦)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا کە دەیەوێت عومرە بکات. خەوێکی بینی بوو لە خەویدا خۆی و هاوەڵەکانی ڕۆشتبوونە ناو مەککەوە بە ئارامی و سەرتاشراوییەوە.

* هاوەڵان دڵخۆش بوون بەوە و خۆیان بۆ ئامادەکرد.

* پێغەمبەر ﷺ هانی ئەو دەشتەکیانەشی دا کە موسڵمان بوو بوون بۆ ئەوەی لەگەڵیان بڕۆن.

* دەشتەکیەکان ساردیان نواند و بڕوبیانوی بێ بنەمایان هێنایەوە و لەگەڵیدا نەڕۆشتن. خوای گەورە باسیان دەکات لەسورەتی فەتح ئایەتی(١١) و ئایەتەکانی دواتر.



* پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە بەڕێکەوت بەرەو مەککە بە (١٤٠٠) پیاوەوە لە هاوەڵەکانی.

* پێغەمبەر ﷺ ئوموسەلەمە. هندی کچی ئەبوئومەیەی خێزانی لەگەڵدا بوو (ڕەزای خوای لێبێ).



* پێغەمبەر ﷺ چەکی لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتبوو جگە لە چەکی گەشتیار، شمشێر لە کێلان و هەروەها (٦٠) وشتر قوربانیشی هێنابوو.

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە میقاتی زیلحولەیفە. کە میقاتی خەڵکی مەدینەیە. لەوێدا ئیحرامی پۆشی و تەلبیەی بە عومرە کرد و کەوتەڕێ بەرەو مەککە.

* هەواڵی هاتنی پێغەمبەر ﷺ گەشتە قورەیش، وتیان: والله ناهێڵین بچێتە ناو مەککەوە.

* کەتیبە (سریە) یەکیان بە سەرۆکایەتی خالدی کوڕی وەلید ئامادەکرد بۆ ڕێگریکردن لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان.

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە ناوچەی عوسفان و بینی ئەمە خالدی کوڕی وەلید و جەنگاوەرەکانێتی و کاتی نوێژی عەسر هات.

* وەحی دابەزی بە شەرعاندنی نوێژی ترس، ئەو نوێژەش لە غەزای حودەیبیە، بووە یەکەمین نوێژی ترس کە ئەنجام بدرێ.

* پێغەمبەر ﷺ خۆی بوارد لە پێکدادان لەگەڵ کافرانی قورەیش، فەرمووی: ( کێ ڕێگەیەکی تر جگە لەم ڕێگەیەمان پیشان ئەدات).

* هاوەڵێك وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕێگایەکی نشێو و سەختی پێگرتنەبەر، توانیان بکەونە پشتەوەی جەنگاوەرانی کافری قورەیش.

* موسڵمانان گەشتنە سەنیەتولمرار، وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت، هەرچی هەوڵیان لەگەڵ دا بکەوێتەڕێ نەجوڵا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ تێی خوڕی ئەویش ڕاپەڕی و کەوتنەڕێ تا گەیشتنە ئەوپەڕی حودەیبیە.

* کاتێ تەواو دڵنیابوون لە حودەیبیە بودەیلی کوڕی وەرقاء بەخۆی و چەن کەسێکەوە هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ .

* وتیان: قورەیش دەرچوون بۆتان بۆ کوشتارتان و ڕێگریکردنتان لە چوون بۆ کەعبە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو بۆ عومرە هاتوین.

* قورەیش ژمارەیە نێردەی خۆیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە مەبەستی دڵنیایی لە هۆکاری هاتنەکەی پێغەمبەر ﷺ، ئایا بۆ شەڕ و جەنگ هاتووە یان بۆ عومرە ؟!

* قورەیش هەریەکە لە: میکرەزی کوڕی حەفس و حیلسی کوڕی عەلقەمە و عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی ناردبوو.

* نێردراوەکانی قورەیش گەڕانەوە و دڵنیابوون لە هۆکاری هاتنەکەی پێغەمبەر ﷺ کە عومرەیە، بەڵگەی ئەوەی کە جلی ئیحرامیان پۆشیوە و قوربانیشیان هێناوە.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بینی، عوسمانی کوڕی عەففانی نارد بۆلای ئەبوسوفیان گەورەی قورەیش بۆ دڵنیاکردنەوەیان لە مەبەستی هاتنەکەیان کە عومرەیە نەك شەڕ.

* کاتێ عوسمان گەشتە لای ئەبوسوفیان پێشوازی لێکرد و وتی لامان بمێنەرەوە تاکو بزانین چ بڕیارێ دەدەین. هەواڵ گەشتە پێغەمبەر ﷺ کە گوایە عوسمان کوژراوە.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەمەی زانی فەرمانیکرد بە هاوەڵەکانی کەبەیعەتی بدەنێ.

پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لەژێر دارەکە و ئەم بەیعەتەش بە بەیعەتی ڕزوان ناسرابوو.

* بۆیە پێی ئەوترا بەیعەتی ڕزوان چونکە خوای گەورە لێیان ڕازی بوو، وەک ئەفەرموێ: { سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێک پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا}.

* ژمارەی ئەوانەی بەشداربوون لە بەیعەتی ڕەزوان (١٤٠٠) کەسبوون.

* هەنێکیان بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مردن، هەندێکیشیان لەسەرئەوەی ڕانەکەن لەکاتی شەڕو پێکدادان.

* ئەمە گەورەترین بەیعەت بوو لە مێژووی ئیسلام دا ڕوویدا. هێندە بەسە کە خوای گەورە لەو کەسانە ڕازی بوو کە بەشداربوون لەم بەیعەتە.

* سەبارەت بەفەزڵ و گەورەیی ئەم بەیعەتە ژمارەیەك فەرمووده هاتووە لەوانە:

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (بەدڵنیاییەوە ئەوەی لەژێر دارەکە بەیعەتی داوە ئەچێتە بەهەشتەوە). ( ترمذی گێراویەتیەوە)

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (هیچ کەس لەوانەی لەژێر دارەکە بەیعەتیان دابێ ناڕۆنە دۆزەخەوە). ( ئەحمەد لەموسنەدەکەی هێناویەتی)

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: إن شاء الله هیچ کەس لەوانەی لەژێر دارەکە بەیعەتیان دابێ ناڕۆنە دۆزەخەوە. (موسلم گێڕاویەتیەوە)

* پیاوێ وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیاییەوە حاتەب ئەچێتە دۆزەخەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا ئەو ناچێتە دۆزەخەوە چونکە ئامادەی بەدر و حودەیبیە بووە). (موسلم گێڕاویەتیەوە)

* جابری کوڕی عبدالله ئەفەرموێ: لە ڕۆژی حودەیبیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووین: (ئێوە باشترینی خەڵکی سەرزەوین). ( شەیخەین گێڕاویانەتەوە)

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی دا بەخۆی لەبری عوسمان، بەدەستی ڕاستی دای لەدەستی چەپی و فەرمووی: (ئەمەش بۆ عوسمان).

* بەمەش عوسمان ئەو شەرەفە گەورەی پێبڕا.

ئەنەس ئەفەرموێ: (دەستی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ بۆ عوسمان لەدەستی ئێمە باشتربوو بۆ خۆمان).

* کاتێ قورەیش بەم بەیعەتەیان زانی ترسان، ئارەزوی ئاگربەست و ئاشتەوایی بوون، بۆیە سوهەیلی کوڕی عەمریان نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ گفتوگۆ .

* سوهەیل و پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم خاڵانە ڕێککەوتن:

١ -ئەمساڵ موسڵمانان دەگەڕێنەوە و ناڕۆنە ناو مەککەوە و، ساڵی داهاتوو دەگەڕێنەوە و (٣) ڕۆژ دەمێننەوە تیایدا.

٢ -هەر هۆزێك پێی خۆشە ببێتە هاوپەیمانی پێغەمبەرﷺ . یا هاوپەیمانی قورەیش بۆی هەیە.

٣ -هەرکەسێ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەموسڵمانی دەبێ بیگەڕێننەوە بەڵام هەرکەسێ لە موسڵمانان هات بۆلای قورەیش و هەڵگەڕاوە لەدینەکەی ناگەڕێنرێتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەمە قورسترین بەندی ڕێککەوتنامەکە بوو لەسەر موسڵمانان.

- ئاگربەست و شەڕنەکردن لەنێوان هەردوولا تا ماوەی (١٠) ساڵ.

* دوای ڕێککەوتنامەکە و ڕێککەوتنی هەردوولا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بەهاوەڵەکانی کە خۆیان لە ئیحرام بکەنەوە و قوربانیەکانیان سەرببڕن.

* لە زۆر توڕەیی هاوەڵان لەوەی کە نەڕۆشتبوونە ناو مەککەوە وعومرەیان نەکردبوو، کەس هەڵنەستا بە جێبەجێکردنی فەرمانەکە*

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە بۆلای ئوموسەلەمەی خێزانی و باسی بەگوێنەکردنی هاوەڵانی بۆکرد.

* ئوموسەلەمە (ڕەزای خوای لێبێ) پێی فەرمووو بڕۆ دەرەوە بۆلایان و بانگی سەرتاشەکەت بکە وسەرت بتاشە.

* پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە دەرەوە و سەرتاشەکەی خیراشی کوڕی ئومەیە (ڕەزای خوای لێبێ) سەری شەریفی تاشی، کاتێ هاوەڵان ئەمەیان بینی زانیان کەئیشەکە تەواو بووە، ئیتر هەموویان ئیحرامیان لادا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ قوربانی خۆی سەربڕی و، هاوەڵانیش قوربانی خۆیان سەربڕی (ڕەزای خوایان لێبێ).

* ئەمە عومرەی ناوداری حودەیبیە بوو، کە تیایدا ڕێککەوتنامە ڕوویدا لەگەڵ قوڕەیش دا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ خۆی سوپاکەی گەڕانەوە بەرەو مەدینە و لەڕێگادا سورەتی فەتح دابەزی.

* پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی پێی خۆش بوو، فەرمووی: (ئایەتێکم بەسەردا دابەزیوە لە هەموو دونیا لام خۆشەویست ترە). (موسلم گێڕاویەتیەوە)

* خوای گەورە ئەفەرموێ: {ئەی پێغەمبەر بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت کە ڕێککەوتنی حودەیبیەیە، تا خوا لەتاوانەکانی ڕابوردو و داهاتووت خۆش ببێت وە نیعمەتی خۆی بەتەواوی برژێت بەسەرتدا و ڕێگای ڕاستت نیشان بدات واتە بەردەوامت بکات}.

* پێشەوا تەحاوی ئەفەرموێ: خەڵکی هەموو یەکدەنگن کە ئەو فەتحەی خوا لەئایەتەکە باسی کردوە مەبەست لێی ڕێککەوتنامەی حودەیبیەیە.

* بۆچی ڕێککەوتنامەی حودەیبیە فەتحێکی گەورە بوو لەئیسلام دا؟
* لەساتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ تا ساڵی حودەیبیە (٦)ی کۆچی (١٩) ساڵ بوو، ژمارەی سوپاکەی پێغەمبەر (١٤٠٠) کەس بوو.
* بەڵام لە حودەیبیەوە تا ساڵی فەتحی مەککە (٢) ساڵ بوو، ژمارەی سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ بوو بە (١٠هەزار) جەنگاوەر.
* جا هەوڵ و مانووبوونی (١٩) ساڵی بانگەواز (١٤٠٠) جەنگاوەر بوو، بەڵام هەوڵی (٢) ساڵی ئاگربەست (١٠)هەزار جەنگاوەر بوو .

* ئەوەی بووە هۆیەك لەم گۆڕانکاریە ئەوەبوو کە ئەم ڕێککەوتنامەیە چەواشەکاری و فشارەکانی قوڕەیشی ڕاگرت لەڕووی بانگەوازی پاکی ئیسلام.
* بانگخوازان کەتنە بانگەواز بەهەموو لایەکدا بەبێ ترس لە قوڕەیش .
* ئەو چەواشەکاری و فشارانەی قوڕەیش بەکاری دەهێنا لەدژی ئیسلام پێش ڕێککەوتنامەی حودەیبیە وای لەخەڵکی کردبوو نەوێرن بێنە ناو ئیسلامەوە.
* دوای ڕێککەوتنامەکە بانگخوازانی ئیسلام کەوتنە بانگەوازکردن و ڕوونکردنەوەی ئاسانکاری و ڕەحمەتی ئیسلام بۆ خەڵکی، خەڵکیش پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلامەوە.

* ڕێککەوتنی حودەیبیە قورەیشی بێلایەن هێشتەوە بەمەش پێغەمبەر ﷺدەستی بەتاڵ بوو بۆ دوژمنە سەرسەختەکەی جولەکەی خەیبەر.

* پێغەمبەر ﷺ دای بەسەر جولەکەی خەیبەرا، ئەگەر ڕێککەوتنی حودەیبیە نەبوایە قورەیش یارمەتی جولەکەکانی دەدا.

* کاتێ پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە بارودۆخەکە سەقامگیربوو بۆ پێغەمبەرﷺ، بەهەلی زانی بانگەوازەکە بگەیەنێتە دەرەوەی جەزیرەی عەرەب.

* پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە پێغەمبەر ﷺ نێردەی دەنارد بۆ پاشاکانی عەرەب و عەجەم، نامەی بۆ دەنوسین و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام .

* ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ نامەی نوسی بۆ کیسرا و قەیسەر و نەجاشی و، هەموو دەسەڵاتدارێ بانگی دەکردن بۆ لای خوا). (موسلم گێڕاویەتیەوە).

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمری دا نارد بۆ نەجاشی، ئەویش باوەڕی هێنا و دانی نا بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا ﷺ .

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە دحیەی کوڕی خەلیفەدا نارد بۆ قەیسەر پاشای ڕۆم وبانگی کرد بۆ ئیسلام، ترسا و ڕاچڵەکی بەڵام باوەڕی نەهێنا.

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە عەبدوڵای کوڕی حوزافەدا نارد بۆ کیسرا پاشای فارس بانگی دەکرد بۆ ئیسلام، کیسرا توڕەبوو و نامەکەی پێغەمبەری ﷺ دڕاند.

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە حاتەبی کوڕی ئەبوبەلتەعەدا نارد بۆ مقەوقس پاشای قیبتیەکان بانگی دەکرد بۆ ئیسلام. بەڵام باوەڕی نەهێنا.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە سەلیتی کوڕی عەمری عامری دا نارد بۆ هەوزەی کوڕی عەلی پاشای یەمامە. بەڵام باوەڕی نەهێنا.

* پێغەمبەر ﷺ نامەی نارد بۆ هەریەکە لە: نەجاشی پاشای حەبەشە. کیسرا پاشای فارسەکان. قەیسەر پاشای ڕۆمەکان. مقەوقس پاشای قیبتیەکان هەوزەی کوڕی عەلی پاشای یەمامە.

* ئەمە ئەو پێنج نامەیە بوو کە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ پاشاکانی دەرەوەی جەزیرەی عەرەبی. جگە لەمانەش لەساڵی (٨)ی کۆچی نامەی تری ناردووە.

* ئەم پێنج نامەیە پێغەمبەر ﷺ لەمانگی موحەڕەمی ساڵی (٧)ی کۆچی دا ناردبووی. جا کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ئەوانەی بۆیان نێردرابوو.

* (٣) ڕۆژ پێش غەزای خەیبەر غەزای زیقەڕەد ڕوویدا پێیشی ئەوترێ غەزای غابە. پاڵەوانی ئەم غەزایە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع بوو.

* هۆکاری ئەم غەزایە ئەوەبوو کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عویەینەی کوڕی حیسن هێرشی کردە سەر دەوروبەری مەدینە و (٢٠) وشتری پێغەمبەری ﷺ برد و موسڵمانێکیشی کوشت و هەڵهات.

* سەلەمەی کوڕی ئەکوەع کەوتە دوویان بەپیادە و بەخۆی تیروکەوانەکەیەوە. توانی ژمارەیەك لەوشترەکان بگەڕێنێتەوە.

* هەواڵ گەشتە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە هاوارکرا: ڕابن ڕابن سوارەکان یەک لەدوای یەک لەدەوری پێغەمبەر ﷺ کۆبونەوە و پێغەمبەر ﷺ کەوتە دوویان.

* پێغەمبەر ﷺ بەخۆی و (٥٠٠) کەس لە هاوەڵانی دەرچوون. کەچی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لەوسەر دەگەڕایەوە و هەموو وشترەکانی پێغەمبەری ﷺگەڕاندەوە.

* ئەبوقەتادە حارسی کوڕی ڕبعی سوارچاکی پێغەمبەر ﷺ کەوتە دووی عەبدورەحمانی کوڕی عویەینەی کوڕی حیسن و. پێیگەیشت و کوشتی.

* لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( باشترین سواریمان ئەمڕۆ ئەبوقەتادە بوو. هەروەها باشترین پیادەشمان سەلەمە بوو). (موسلم گێڕاویەتیەوە).

* لەم غەزای زیقەرەدەدا (کە پێیشی ئەوترێ غەزای غابە ) پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی بە هاوەڵەکانی کرد. ( پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەی هێناویەتی بەسەنەدێکی سەحیح)

* پاشان پێغەمبەر ﷺ لە زیقەرەد دانیشت و دەستیکردە گاڵتە و یاریکردن و پێکەنانندنی هاوەڵەکانی.

* بیلال (ڕەزای خوای لێبێ) وشترێکی سەربڕی و لەجەرگەکەی و بان پشتەکەی برژاند.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بەسەرکەوتووی گەڕایەوە مەدینە لەگەڵ هاوەڵان و هەموو وشترەکانیشی گەڕاندبوویەوە.

* له مانگی موحه‌ڕه‌می ساڵی (٧)ی كۆچی غه‌زای خه‌یبه‌ر ڕوویدا.

* خه‌یبه‌ر ته‌نها جوله‌كه‌ی لێ نیشته‌جێ بوو، هه‌روه‌ها شوێنی پلاندانان بوو دژی موسڵمانان .

* جوله‌كه‌ی خه‌یبه‌ر بوون ئه‌حزابیان كۆكرده‌وه بۆ هێرشكردنه سه‌ر مه‌دینه. بۆیه خه‌یبه‌ر شوێنی فیتنه و ئاشوب نانه‌وه بوو.

* خوای گه‌وره په‌یمانی فه‌تحی خه‌یبه‌ری دابوو به پێغه‌مبه‌ر ﷺ له قورئانه‌كه‌یدا. خوای گه‌وره له‌سوره‌تی فه‌تح ئه‌فه‌رموێ: {خوا به‌ڵێنی پێ داوون كه غه‌نیمه‌تی زۆر ( له بێ باوه‌ڕان) ده‌گرن بۆیه ئه‌مه‌ی (غه‌نیمه‌تی خه‌یبه‌ر) بۆ پێش خستن وه ده‌ستی خه‌ڵكی (مه‌ككه‌ی) لێتان كۆتا كرد تا ئه‌م ڕووداوه ببێته به‌ڵگه‌یه‌ك بۆ باوه‌ڕداران وه تا ڕێنموونیتان بكات بۆ ڕێگای ڕاست}.

* خه‌یبه‌ر ده‌سكه‌وتێكی تایبه‌ت بوو به ئه‌وانه‌ی به‌شداری حوده‌یبیه‌یان كردبوو، بۆیه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمانیكرد ته‌نها ئه‌وانه له‌گه‌ڵیدا ده‌رچن كه له حوده‌یبیه به‌شداربوون ژماره‌یان (١٤٠٠) كه‌س بوو.

* پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌خۆی و سوپاكه‌یه‌وه ده‌رچوون به‌ره‌و خه‌یبه‌ر، كاتێ گه‌شته خه‌یبه‌ر و، جوله‌كه بینیان ترسان و ڕۆشتنه ناو قه‌ڵاكانیانه‌وه و، هاواریان كرد: محمد و سوپاكه‌ی.

* كاتێ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌م ترسه‌ی جوله‌كه‌كانی بینی فه‌رمووی: ( الله اكبر خه‌یبه‌ر خراپ بوو، ئێمه ئه‌گه‌ر دابه‌زینه مه‌یدانی هه‌ر قه‌ومێك ئه‌وا خراپترین سپێده‌ی ترسێنه‌ر ڕوویان تێده‌كات).

* گەمارۆ خرایە سەر خەیبەر و، گەمارۆدانەکە توند بوو لەسەریان. پاڵەوانێتی هاوەڵان دەرکەوتن و، ناوبەناو هێرشەکانی هاوەڵان دەیهەژاندن.

* لەو پاڵەوانانە: زوبەیری کوڕی عەوام و، عەلی کوڕی ئەبوتالیب و، ئەبودوجانە و، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع بوون ڕەزای خوایان لێبێ .

* عەلی مەرحەبی کوشت و، زوبەیر یاسری برای مەرحەبی کوشت. زیاتر لەنیوەی خەیبەر کەوتە دەست موسڵمانان.

* کاتێ جولەکە دڵنیابوون کە لەناوئەچن، خۆیان دابەدەستەوە و، داوای گفتوگۆیان کرد لەپێغەمبەر ﷺ لەسەرئەوەی کەماوەتەوە لەخەیبەر، ئەویش ڕازی بوو.

* ڕێککەوتن لەسەر ئەمانە:

١- پاراستنی خوێنی ئەوانەی لەقەڵاکاندا ماونەتەوە.

٢- ژن و منداڵیان سەلامەتبێ.

٣ جولەکە خاکی خەیبەر چۆڵ بکەن.

٤ هەرچیان بوێ ببیەن لەگەڵ خۆیان جگە لە چەك.

* کاتێ جولەکەکانی خەیبەر ویستیان خەیبەر چۆڵ بکەن داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەخەیبەر بیانهێڵێتەوە وەکو کرێکار کاری کشتوکاڵیان بۆ بکەن بەنیوەی بەروبومی ساڵێ.

* پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو بەوە، لەبەرئەوەی نە پێغەمبەر ﷺ و نەهاوەڵان دەستی کاریان نەبوو هەستن بەوکارە. زەوی خەیبەریش فراوان بوو هەمووی دارخورمابوو.

* موسڵمانان بەفەتحی خەیبەر دەوڵەمەند بوون، عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێبێ ئەفەرموێ: تێرمان نەخوارد تاکو خەیبەرمان فەتح کرد. (بوخاری گێڕاویەتیەوە)

* بوخاری لەدایکە عائیشە وە ئەگێڕێتەوە فەرموویەتی : کاتێ خەیبەر فەتح کرا، وتمان ئێستا تێر خورما ئەخۆین ئەوەش لەبەر زۆری دارخورمای خەیبەر.

* ئەوانەی کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا لەخەیبەر بوو، لەسەرووی هەموویانەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب (ڕەزای خوای لێبێ)، پێغەمبەر ﷺ زۆر پێی دڵخۆشبوو.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نازانم بەکامەیان دڵخۆشبم، بەفەتحی خەیبەر یا بەهاتنی جەعفەر). ( حاکم گێڕاویەتیەوە).

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو ئەشعەرییەکان هاتن بۆلای، (٥٣) کەس بوون، ئەبوموسای ئەشعەری لەناویاندا بوو( ڕەزای خوای لێبێ)

* پێش هاتنی ئەشعەرییەکان بەڕۆژێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سبەی قەومێك دێت بۆلاتان دڵیان لەئێوە نەرمترە بۆ ئیسلام* ئەوەبوو ئەشعەرییەکان هاتن).

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەر لەخەیبەر بوو هۆزی دەوس هاتن بۆلای، لەسەرووی هەموویانەوە توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی، هەروەها گێڕەرەوەی ئیسلام ئەبوهورەیرە ( ڕەزای خوای لێبێ) .

* سەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب کەوتە ناوکەنیزەکەکان، پێش ئەوەی خەیبەر خۆی بدات بەدەستەوە بەرێککەوتن.

* پێغەمبەر ﷺ ئیسلامی بۆ باسکرد ئەویش موسڵمان بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد و خواستی و ئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی و بوو بەیەکێ لە دایکانی باوەڕداران.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە غەزای خەیبەر بوەوە، زەینەبی کچی حارسی جولەکە مەڕێکی برژاوی ژەهراوی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا.

* پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵەکانی فەرموو، دوای ئەوەی لێیان خواردبوو: (دەستان هەڵگرن ئەمە ژەهراویە).

بیشری کوڕی بەڕائی کوڕی مەعروڕ وەفاتیکرد بەهۆی ژەهرەکەوە.

* پێغەمبەر ﷺ بە زەینەبی کچی حارسی وت: (خوا تۆ سەرناخا بەسەر منا).

دواتر زەینەبی کوشت لەتۆڵەی بیشردا.

* جولەکەی خەیبەر لە خەیبەر مانەوە و نیوەی بەروبومیان بۆ هەبوو لەبری کارکردن لە زەویە کشتوکاڵیەکاندا تا سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ) .

* لە سەردەمی خەلافەتی عومەر کەسێکیان لە موسڵمانان کوشت، عومەر داوای بکوژەکەی کرد، ڕەتیان کردەوە ڕادەستی بکەنەوە. عومەریش دەریکردن لە خەیبەر بەرەو شام. جەزیرەی عەرەبی لە جولەکە پاك کردەوە.

* پێغەمبەر ﷺ بەسەرکەوتوویی بەرەو مەدینە گەڕایەوە. کاتێ کێوی ئوحودی لێ وەدیارکەوت فەرمووی: (ئەمە کێوێکە خۆشی ئەوێین و خۆشمان ئەوێ).

* دوای غەزای خەیبەر غەزای زاتوریقاع ڕوویدا. بۆیە وا ناوبراوە چونکە پەڕۆیان بەپێیانەوە بەستبوو. پێڵاویان نەبوو.

* هۆکاری ئەم غەزایەش ئەوەبوو هەواڵ گەشتبوە پێغەمبەر ﷺ کە غەتەفان خۆیان کۆکردۆتەوە و ئەیانەوێ هێرش بکەنە سەر مەدینە.

* پێغەمبەر ﷺ بەخۆی و (٤٠٠) کەسەوە دەرچوو بۆیان .

* کاتێ بیستیان پێغەمبەر ﷺ هاتووە بۆیان هەڵهاتن .

* پێغەمبەر ﷺ لەم غەزایە نوێژی ترسی کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە.

* له مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٧)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەرەو عومرە. بەپێی بەندەکانی ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە یەك ساڵی تەواوی بەسەردا تێپەڕی.

* ئەم عومرەیە ناونرا بە عومرەی قەزاء یا قەزیە. چونکە پێغەمبەر ﷺ قەزاوەتیکرد لەگەڵ قورەیشدا لە ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە. کە ساڵی دواتر عومرەکەیان ئەنجام بدەن.

* پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوانەی کەلە حودەیبیە لەگەڵیدا بەشداربوون جگە لەوانەی کە کۆچی دواییان کردبوو (ڕەزای خوایان لێبێ) کەوتەڕێ بەرەو عومرە .

* پێغەمبەر ﷺ (٦٠) وشتری لەگەڵ خۆی برد وەکو قوربانی و چەکیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرت لە ترسی خیانەتی قورەیش.

* پێغەمبەر ﷺ خۆی و ئەوەی لەگەڵیدا بوو لە هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لێبێ) تەلبیەیان کرد بە عومرە و لە میقاتەوە کەوتنەڕێ بەرەو مەککە.

پێغەمبەر ﷺ دوای (٧) ساڵ دابڕان گەشتە مەککە و لە دەرگای بەنی شەیبەوە ڕۆشتە ژوورەوە بۆ ناو مزگەتی حەرام.

* پێغەمبەر ﷺ بە گۆچانەکەی دەستی گەیاندە بەردە ڕەشەکە و پاشان (٧) جار تەوافی بەدەوری بەیتدا کرد و دواتر لە پشتی مەقامی ئیبراهیم دوو ڕکات نوێژی کرد.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ سەعی نێوان سەفا و مەڕوە و بە وشترەکەیەوە ئەنجامیدا. پاشان قوربانیەکەی سەربڕی.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ سەری شەریفی تاشی. مەعمەری کوڕی عەبدوڵای عەدەوی سەری تاشی ( ڕەزای خوای لێبێ). پاشان هاوەڵانیش ( ڕەزای خوایان لێبێ) وایان کرد.

* پێغەمبەر ﷺ (٣) ڕۆژ مایەوە لە مەککە هەروەکو لە بەندەکانی ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە هاتوە.

* پێغەمبەر ﷺ نەڕۆشتە ناو کەعبەوە. لەبەر بوونی بت و پەیکەرەکانی ناوی.

* پێغەمبەر ﷺ لە مەککە گەڕایەوە کاتێ گەشتە سەریف مایەوە لەوێدا.

* پێغەمبەر ﷺ لە ناوچەی سەریف دایکی باوەڕداران مەیمونەی کچی حارسی خواست. ئەمە کۆتا ژن بوو کە پێغەمبەر ﷺ خواستی.

* دایکە مەیمونە( ڕەزای خوای لێبێ) ساڵی (٥١) وەفاتیکرد.

* لەسەرەتاکانی ساڵی (٨)ی کۆچی زەینەبی کچی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد و لە بەقیع ناشتیان، زەینەب (ڕەزای خوای لێبێ) کچە گەورەی پێغەمبەر بوو .

* لە مانگی سەفەری ساڵی (٨)ی کۆچی هەریەکە لە: خالدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص وعوسمانی کوڕی تەڵحە باوەڕیان هێنا و هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە .

* پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی بەمە خۆشبوو و فەرمووی : (مەککە گەنجینە لاوەکانی فڕێدا).

* لەمانگی جەمادولئولای ساڵی (٨)ی کۆچی غەزای گەورەی موئتە ڕوویدا، لە نێوان موسڵمانان و غەساسینەکان، ناونرا غەزا ئەگەرچی خودی پێغەمبەر ﷺ بەشدارنەبوو تیایدا .

* خوای گەورە ڕووداوەکانی غەزاکەی پیشانی پێغەمبەر ﷺ دەدا لە مەدینە .

* هۆکارەکەی کوشتنی نێردەی پێغەمبەر بووﷺ، حارسی کوڕی عومەیر (ڕەزای خوای لێبێ ) .

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی پێدا ناردبوو بۆ پاشای بوسرا لە شام، شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی لێی هاتە پێش و کوشتی.

* کوشتنی نێردراو و سەفیر لە ناشرینترینی تاوانەکان بوو، داب و نەریت و عورف وابوو کە نەکوژرێن.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بە ئامادەکاری بۆ شەڕی غەساسینەکان. (٣٠٠٠) جەنگاوەر بەدەم بانگەوازەکەی پێغەمبەرەوە هاتن.

* ئەمە گەورەترین سوپای ئیسلام بوو لە ساتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەوە ﷺ .

* پێغەمبەر ﷺ ئازادکراوی خۆی، زەیدی کوڕی حاریسەی کردە ئەمیر و گەر کوژرا جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، ئەگەر ئەویش کوژرا، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە. ( ڕەزای خوایان لێبێ ) .

* پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەکی سپی دایە دەستی زەیدی کوڕی حاریسەوە.

* خالدی کوڕی وەلید لەم غەزایەدا بەشداریکرد، ئەمەش یەکەمین بەشداریکردنی خالد بوو لەوکاتەوەی موسڵمان بوو بوو (ڕەزای خوای لێبێ).

* سوپای موسڵمانان کە ژمارەیان دەگەیشتە (٣ هەزار) جەنگاوەر، گەیشتە ناوچەی مەعان، هەواڵیان پێگەشت کە سوپای غەساسینەکان (٢٠٠ هەزار) جەنگاوەرە.

* موسڵمانان هاوشێوەی سوپایەکی وەها ژمارە زۆریان بەخەیاڵدا نەهاتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆری دوژمنەکەیان نەیترساندن.

* زەید (ڕەزای خوای لێبێ) سوپاکەی دابەشکرد بۆ:لای ڕاست و قوتبەت کوڕی قەتادەی کردە سەرکردەیان، لای چەپ عەبایەی کوڕی مالکی ئەنساری کردە سەرکردەیان .

* سوپای موسڵمانان کەوتنەڕێ بەرەو ناوچەی موئتە و هەردوو سوپا بەیەك گەشتن، سەرنج بدە ( ٣ هەزار) بەرامبەر (٢٠٠ هەزار)!

* شەڕ دەستیپێکرد .

بەڕاستی جەنگێکی گەورەبوو، کۆمەڵێ پاڵەوانی گەورە گەورە دەرکەوتن لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ). کە دوژمنی تووشی شۆك کرد.

* زەید ئاڵاکەی بەرزکردەوە و دەستی کرد بە کوشتاری کافران بە ئازایەتیەکی زۆرەوە و بە بوێرییەکی دەگمەنەوە، موسڵمانانیشی لەگەڵ بوو. تا کوژرا (ڕەزای خوای لێبێ).

* کاتێ زەید کوژرا جەعفەر ئاڵاکەی بەرزکردەوە و ئەویش شەڕێکی نمونەیی و دەگمەنی کرد تا کوژرا (ڕەزای خوای لێبێ).

* کاتێ جەعفەر کوژرا، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی بەرزکردەوە و بە سواریەوە کوشتاری کافرانی دەکرد بەرەو پێشەوە دەڕۆشت تاکو ئەویش کوژرا (ڕەزای خوای لێبێ).

* خوای گەورە ڕووداوەکانی غەزاکەی پیشانی پێغەمبەر دەدا لە کاتێکدا لە مەدینەش بوو.

* کاتێ سەرکردەکانی غەزای موئتە کوژران پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێیان خۆش نەدەبوو ئەگەر ئێستا لای ئێمە بوونایە.

* پێغەمبەر ﷺ ئەوەی سەبارەت بەو خۆشیە وت کە دوای شەهیدبوونیان تیایدان ( ڕەزای خوایان لێبێ) .

* کاتێ عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە کوژرا، ئاڵاکە کەوت و پێغەمبەریش ﷺ کەسی ڕانەسپاردبوو لەدوای عبدالله بە هەڵگرتنی ئاڵاکە.

* سابتی کوڕی ئەقرەم ڕۆشتە پێشەوە و ئاڵاکەی هەڵگرت و موسڵمانان لەدەوری کۆبوونەوە لە نێویشیاندا خالدی کوڕی وەلیدی تێدابوو. سابت ئاڵاکەی دا بە خالد و خالدیش ئاڵاکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوە.

* کاتێ خالد ئاڵاکەی هەڵگرت، پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بە هاوەڵەکانی فەرموو: (شمشێرێ لە شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی هەڵگرت).

* خالد (ڕەزای خوای لێبێ)، توانی سوپاکەی ڕێکبخاتەوە و دامەزراو بێ بەرامبەر ئەم زریانە لە دوژمنان و دەستیکرد بەهێرشکردن بۆ سەریان.

* پاشان خالد (ڕەزای خوای لێبێ)، توانی سوپای موسڵمانان بپارێزێ و پاشەکشێ بکات بەبێ زیان و بگەڕێنەوە مەدینە .

* فەرموودەی: ( هەڵهاتووان نین بەڵکو دووبارە گەڕاوەکانن إن شاء الله). کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کە سوپای موئتە گەڕانەوە مەدینە .

* خەڵکی ئەیانوت: ئەی هەڵهاتووان.( فەرمودەکە ئیبنوئیسحاق لەسیرەکەیدا هێناویەتی بە سەنەدێکی لاواز، ئیبنو کەسیریش بە لاوازی داناوە ).

* پێغەمبەر ﷺ سەردانی ماڵی جەعفەری کرد دوای شەهیدبوونی و بە خێزانەکانی فەرموو: (نان درووست بکەن بۆ ماڵی جەعفەر، چونکە خۆیان توشی شتێك هاتوون سەرقاڵی کردون).

* له مانگی جەمادولئاخیری ساڵی (٨)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ بە عەمری کوڕی عاصی فەرمووو: (ئەمەوێ بە سەرکردایەتی سوپایەك بتنێرم خوا ئەتپارێزێ و دەسکەوتیشت ئەداتێ).

* عەمر وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا من بۆ پارە و ماڵ موسڵمان نەبووم. بەڵکو بۆ جیهاد کردن و مانەوە لەگەڵ خۆتدا موسڵمان بووم).

* پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووو: (ئەی عەمر پارەی باش هەر بۆ پیاوی باش نیعمەتە).

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە (٣٠٠) جەنگاوەرەوە ناردی بۆ زاتوسەلاسیل.

* عەمر و سریەکەی دەرچوون و ئامانجەکەش کۆمەڵێ بوون لە هۆزی قوزاعە گردبوونەوەیان کردبوو بۆ هێرشکردنە سەر مەدینە .

* عەمر لەناکاو دای بەسەریانا و زیانێکی زۆری پێگەیاندن.

* عەمر بە سەرکەوتویی گەڕایەوە مەدینە. لە سریەکەشدا نەبریندار و نەکوژراو نەبوو. پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی پێخۆشبوو.

* له مانگی شەعبانی ساڵی (٨)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەبوقەتادە. حارسی کوڕی ڕبعی بە سریەیەکەوە نارد بۆ سەر گردبوونەوەیەکی غەتەفان.کە ئەیانویست هێرش بکەنە سەر مەدینە .

* ئەبوقەتادە و ئەوەی لەگەڵیدا بوو توانیان لەناکاو بدەن بەسەر گردبونەوەکەی غەتەفاندا.

* هەندێکیان لێ کوشتن و هەندێکیان لێ بەدیل گرتن و هەندێکی تریشیان هەڵهاتن.

# گەورەترین فەتح

# لە مێژووی ئیسلامدا



* لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی گەورەترین فەتحکردن لە مێژووی ئیسلامیدا ڕوویدا، ئەویش فەتحی مەککە بوو. خوای گەورە لەو ڕۆژەدا پێغەمبەرەکەی و دینەکەی سەرخست.

* هۆکاری ئەم فەتحە گەورەیەش، خیانەتی بەنی بەکر و قورەیش بوو کردیان لە هۆزی خوزاعە کە بووبووە هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێککەوتنەکەی حودەیبیە، (٢٠) پیاویان لێکوشتن.

* عەمری کوڕی سالمی خوزاعی ڕۆشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە و هەواڵی خیانەتەکەی بەتەواوی پێدا.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سەرخرای ئەی عەمری کوڕی سالم).

* قورەیش لەم خیانەتەی کردیان ترسان، ئەبوسوفیانیان نارد بۆ لای پێغەمبەرﷺ، بۆئەوەی ڕێککەوتنەکە نوێبکاتەوە، بەڵام بەبێ ئومێدی گەڕایەوە وهیچی بۆ نەکرا.



* پێغەمبەر ﷺ خۆی ئامادەکرد بۆ فەتحە گەورەکە و داوای لە خوا کرد کە هەواڵی نەگات بە قورەیش، و فەرمووی: (خوایە جاسوس و هەواڵەکان لە قورەیش بگرەوە).

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵانی بۆ دەرچوون، هەروەها ناردی بە دوای هەموو ئەو هۆزانەشدا کە موسڵمان بوون لەگەڵیدا دەرچن بۆ فەتحی مەککە .

* (١٠هەزار) کۆبووەوە بۆ پێغەمبەرﷺ، ئەمە گەورەترین سوپایە لەساتی پێغەمبەرایەتیەوە بۆ موسڵمانان کۆبوبێتەوە.

* پێغەمبەر ﷺ لە (١٠)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی لە مەدینە کەوتەڕێ .

* لە ڕێگادا بۆ مەککە هەریەکە لە ئەبوسوفیانی کوڕی حارس ئامۆزای و، پورزاکەی عەبدوڵای کوڕی ئەبوئومەیەی کوڕی موغیرەی پێگەیشتن بە موسڵمانێتی.

* پێغەمبەر ﷺ بەردەوامبوو لە ڕۆیشتن بەرەو مەککە و بەڕۆژووش بوو، خەڵکیش بەڕۆژوو بوون.

* پێغەمبەر ﷺ ئاوی دەکرد بەسەر و ڕووخساریدا لەبەر زۆر تینوێتی.

* کاتێ گەشتە کەدید، (ئاوێکە لەنێوان عوسفان و قودەید) بە هاوەڵەکانی فەرموو: (بەڕاستی لە دوژمن نزیکبوونەتەوە بەڕۆژوو نەبوون باشترە بۆتان بۆ بەهێزبونتان).

* پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووەکەی شکاند و خەڵکیش ڕۆژوەکانیان شکاند، پاشان داوای دەفرێ ئاوی کرد و خواردیەوە بۆئەوەی خەڵکی بیبینن.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە جوحفە، عەباسی مامی بەخۆی و خێزان و منداڵیەوە پێی گەیشتن، لەکاتێکدا ئەیویست کۆچ بکات بۆ مەدینە، پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی پێی خۆشبوو .

* عەباس(ڕەزای خوای لێبێ) بەهاتنی سوپای موسڵمانانی نەزانیبوو، بۆیە کۆتا کەسبوو کۆچبکات بۆ مەدینە، چونکە دوای ئەوە ئیتر مەککە فەتحکرا.

* پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( دوای فەتح ئیتر کۆچ کردن نیە ) مەبەست لێی فەتحی مەککەیە.

* مەبەست لەم کۆچ کردنەش کە لە فەرموودەکەدا هاتووە کۆچ کردنی تایبەتە لە مەککەوە بۆ مەدینە .

* فەرموودەی: (ئەی مامە دڵنیابە تۆ کۆتایی کۆچەرییەکانی وەکو چۆن من کۆتایی پێغەمبەرانم). (ئەحمەد بەسەنەدێکی زۆر لاواز گێڕاویەتیەوە).

* پێغەمبەر ﷺ ڕێگای دەبڕی بەرەو مەککە تاوەکو گەیشتە ناوچەی زەهران دوای شێوان، فەرمانیکرد بە هاوەڵەکانی ئاگر بکەنەوە.

* خوای گەورە جاسوس و هەواڵەکانی لە قورەیش گرتەوە و نەیانئەزانی پێغەمبەر ﷺ چییان پێدەکات.

ئەبوسوفیان و حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقاء، هەموویان دوای فەتح موسڵمان بوون (ڕەزای خوایان لێبێ)، دەرچوون لە مەککە بۆ گەڕان بەدوای هەواڵدا.

* لە مەککە دەرچوون تا گەشتنە مەڕزەهران و ئاگرەکانیان بینی کە زۆر زۆر بوو (١٠هەزار) جەنگاوەر زۆر ترسان و ڕاچڵەکین.

* ئا لەم ماوەیەدا عەباس بەدوای کەسێکدا دەگەڕا هەواڵی پێغەمبەر ﷺ بدات بە قوڕەیش، بۆئەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن و شەڕنەکەن.

* عەباس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەبوسوفیان گەورەی مەککەی بینی هەریەکە لە حەکیمی کوڕی حیزام و بودەیلی کوڕی وەرقائیشی لەگەڵ بوو.

* عەباس ئەبوسوفیانی ڕازیکرد بەوەی مەککە ڕادەستبکات و شەڕنەکات.

* کاتێ ئەبوسوفیان قەبارەی سوپاکەی پێغەمبەری ﷺ بینی (١٠ هەزار) جەنگاوەر، زانی کە توانای بەگژداچوونەوەی نییە و ڕازی بوو بە ڕادەستکردنی مەککە.

* عەباس ئەبوسوفیانی برد بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی مەککەی ڕادەست بکات.

* کاتێ ئەبوسوفیان چووە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەر ﷺ بانگیکرد بۆ ئیسلام، ئەویش باوەڕی هێنا .

* پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە پارێزراوە و ناکوژرێ، هەرکەسێ بچێتە مزگەوتی حەرامەوە پارێزراوە و ناکوژرێ، هەر کەسێ دەرگا لەسەرخۆی داخا پارێزراوە و ناکوژرێ).

* پاشان ئەبوسوفیان ڕۆشت و لەگەڵ خەڵکی مەککەیە کۆبووەوە و هەواڵی پێغەمبەری پێدان و ڕوونیکردەوە کە توانای سوپای موسڵمانانیان نیە.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بەجوڵەکردن بەرەو چوونە ژورەوە بۆناو مەککە و بە هاوەڵانی فەرموو: (شەڕمەکەن تەنها لەگەڵ ئەوانەدا نەبێ کە شەڕتان لەگەڵ دەکەن، نەهی لێکردن ژن و منداڵ بکوژن).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە لەسەرووی مەککەوە، لە کەدائەوە لەناو کەتیبە سەوزە تایبەتەکەیەوە. لەڕۆژی جومعە (١٩)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨)ی کۆچی، بەڕاستی ڕۆژێکی گەورە بوو.

* پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕۆشتنە ژوورەوەی بۆناو مەککە لەسەر وشترەکەی (قەسواء) بوو، زۆر بەشێوەیەکی خاکی و خۆبەکەم زانین بۆ خوای گەورە ڕۆشتە ژوورەوە. کە ڕێزی لێنا بەم فەتحە ( فەتحی مەککە) .

* پێغەمبەر ﷺ لەسەر وشترەکەیەوە سورەتی فەتحی بەدەنگی بەرز دەخوێند و خەڵکی مەککە سەیری ئەم دیمەنە گەورەیەیان دەکرد.

* پاشان خێمەیەك لە ناوچەی خەیف لێدرا بۆ پێغەمبەر ﷺ هەروەکو فەرمانی کردبوو.

* ئوموهانیئ (ڕەزای خوای لێبێ) هات و داوای مۆڵەتی خواست کە بچێتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەخێربێی ئوموهانیئ).

* ئوموهانیئ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داڵدەی فلان و فلانم داوە، دوو کەسی نزیکی خۆی بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (داڵدەی ئەوکەسە دەدەین کە داڵدەت داوە).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ هات تا گەیشتە مزگەتی حەرام موهاجرین و ئەنسار لەپێش و پاش و دەوروبەریەوە بوون الله أكبر و لا إله إلا الله یان دەکرد.

* پێغەمبەر ﷺ ڕوویکردە بەردەڕەشەکە و بەگۆچانەکەی دەستی لێدا. پاشان (٧) جار بەسواری وشترەکەیەوە تەوافی کرد.

* (٣٦٠) بت و پەیکەر بەدەوری کەعبەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ دەگەشتە هەر بتێك بەگۆچانەکەی لێی دەدا و ئەیفەرموو: {بڵێ: تازە حەق و ڕاستی هاتووە و بەرپا بووە، بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچوون و جێگیر نەبووە و بەزیووە}.

هەروەها {بڵێ: حەق و ڕاستی هات و بەتاڵ و ناحەقی بونی نەما* نە دەتوانێ دەست پێبکاتەوە، نە دەتوانێ بگەڕێتەوە دۆخی جارانی}.

* پێغەمبەر ﷺ بە گۆچانەکەی دەیدا لەهەر بتێك لەڕوویەوە بەپشتا دەکەوت، هەرکە دەکەوتیش خێرا هاوەڵان ورد و خاشیان دەکرد. تاکو هەر(٣٦٠) بتەکە بەتەواوی شکێنران.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بانگی دەرگاوانی کەعبە عوسمانی کوڕی تەڵحەی کرد (ڕەزای خوای لێبێ)، چونکە کلیلی دەرگای کەعبە، لای ئەو بوو.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد دەرگای کەعبە بکاتەوە، کاتێ کردیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەعومەری کوڕی خەتتاب کرد ئەو وێنە و پەیکەرانەی تێیدایە لایبات.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو کەعبەوە و بیلال و ئوسامەی کوڕی زەیدی لەگەڵدا بوو (ڕەزای خوایان لێبێ) دەرگاکەی داخست و ماوەیەك تیایدا مایەوە.

* پێغەمبەر ﷺ ستونێکی خستە لای چەپیەوە و دوو ستونیشی خستە لای ڕاستیەوە و سێ ستونیشی خستە پشتیەوە. ئەوکات کەعبە لەسەر شەش ستون (پایە) بوو* پاشان دووڕکات نوێژی کرد.

*پێغەمبەر ﷺ لە کەعبە هاتە دەرەوە. خەڵکی مەککە هەمووی گردبوونەوە و پێغەمبەر ﷺ وتارێکی بەنرخی بۆدان.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی گرۆی قورەیش وائەزانن چیتان پێئەکەم ؟)

* وتیان: چاکەمان لەگەڵ ئەکەی. برایەکی بەڕێز و کوڕی برایەکی بەڕێزی.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەوەتان پێ ئەڵێم کە یوسف بەبراکانی وت { ئەمڕۆ لۆمەتان لەسەر نیە}. بڕۆن ئێوە ئازادن).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دانیشت و کلیلی دەرگای کەعبەی بەدەستەوە بوو.

* عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەرگاوانی و ئاودان بە حاجیان بخەرە ئەستۆی ئێمە.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( کوا عوسمانی کوڕی تەڵحە ؟)

* بانگیان کرد و پێی فەرموو: (ئەم کلیلە بگرن ئەی نەوەی بەنی تەڵحە تاهەتایە. کەس لێتانی نابا مەگەر ستەمکارنەبێت).

* کاتێ بارودۆخەکە سەقامگیربوو خەڵکی مەککە دەهاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بەیعەتیان دەدا. ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) ئەبوقوحافەی باوکی هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و باوەڕی هێنا .

* پاشان ژنانی قورەیش بەیعەتیان دەدا بە پێغەمبەر ﷺ .

* پاشان پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێ فەتوای حەرامکردنیدا. لەوانە: خوارنەوەی مەی، خواردنی مردارۆبوو، بەراز، بت پەرستی.

* فەتحی مەککە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەدڵی عەرەب، چونکە چاوەڕێی کۆتایی ململانێی نێوان پێغەمبەر و قورەیش بوون.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەرکەوت بەسەر قورەیشدا و مەککە فەتح کرا، خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلامەوە.

* پێغەمبەر ﷺ (١٩) ڕۆژ لە مەککە مایەوە .

* لە ڕۆژی شەممە (٦)ی شەوالی ساڵی (٨)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەرەو حونەین، دۆڵێکی نزیکی تائیفە.

* هۆکارەکەی ئەوەبوو کە هەواڵی پێگەیشتبوو هەوازن خەڵکی تائیف گردبوونەوەیەکی گەورەیان کردووە بۆ هێرشکردنە سەر پێغەمبەر ﷺ لە مەککە .

* پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆیان پێش ئەوەی ئەوان بێن.

* هەوازن (٢٠ هەزار) جەنگاوەری کۆکردبووەوە. هەروەها ژن و منداڵ و ماڵ و وشتر و مەڕوماڵاتیان هەمووی لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. سەرکردەکەیان مالکی کوڕی عەوف بوو.

* پێغەمبەر ﷺ بە (١٢هەزار) کەسەوە دەرچوو بۆیان (١٠ هەزار) ی ئەوانەبوون کە لە مەدینەوە لەگەڵیدا هاتبوون و (٢ هەزار) یش لە خەڵکی مەککە .

* پێغەمبەر ﷺ لە دوای خۆی عەتابی کوڕی ئەسیدی کردە دەسەڵاتداری مەککە ( ڕەزای خوای لێبێ). ئەمەش یەکەمین ئەمیرە لە ئیسلامدا.

* لە ڕێگادا بەرەو حونەین گەشتن بەدارێك پێی ئەوترا (زاتوئەنوات). عەرەب پێشتر تەبەروکیان پێوەدەکرد و دەستیان پێدا دەهێنا و دەیانپەرست.

* ئازادکراوانی خەڵکی مەککە کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووبوون و لە ئیسلامێتیاندا لاوازی هەبوو. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا زاتوئەنواتێکیش بۆ ئێمە دانێ وەکو چۆن ئەوان زاتوئەنواتیان هەیە ؟!

* پێغەمبەر ﷺ توڕەبوو فەرمووی: ( الله أكبر سوێن بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە. ئەو قسەیەتان کرد کە قەومەکەی موسا بە موسایان وت. خوایەکمان بۆدانێ وەکو چۆن ئەوان خوایان بۆخۆیان داتاشیوە ! )

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە دۆڵی حونەین. لەکاتی سەحەردا سوپاکەی ڕێکدەخست بەشێوەی ڕیزی ڕێکوپێک.

* پێغەمبەر ﷺ خالدی کوڕی وەلیدی کردە سەردەستەی سوارەکان و مۆژدەی سەرکەوتن و فەتحی پێدان ئەگەر ئارامبگرن و دامەزراوبن.

* هەندێ لە تازە موسڵمانەکان سەرسام بوون بە زۆری ژمارەیان و وتیان: ( والله ئەمڕۆ شکست ناهێنین لەبەر کەمی ژمارەمان). ئەمانە بەهۆی ژمارە زۆریەوە دڵخۆشبوون.

* موسڵمانان دەستیان کردە هاتنە خوارەوە بۆ دۆڵەکە. زۆر لێژبوو. ئاگاشیان لە بۆسەی دوژمنان نەبوو کە پێشوەخت بۆیان دانرابوو.

* کاتێ دابەزینە دۆڵەکە. تووشی بۆسەی کەتیبەکانی هەوازن بوون کەبە پەلاماردانی یەك کەس کەوتنە پەلاماردانی موسڵمانان و لەپێشدا لە خالدیان دا تاکو خستیان.

* سوارەکانی بەنی سولەیم هەڵهاتن و پشتیان هەڵکرد و خەڵکی مەککە. تازە موسڵمانان بووەکان. شوێنیان کەوتن. هەڵهاتنی موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە دەستپێکرد .

* بەرائی کوڕی عازب ئەفەرموێ:موسڵمانان تووشی قەومێکی تیرهاوێژ هاتن نزیکبوو هیچ تیرێکیان هەڵە نەکات. کەوتنە تیر بارانکردنی موسڵمانان .

* پێغەمبەر ﷺ خۆیدا بەلای ڕاستدا و کۆمەڵێکی کەم لەگەڵیدا مانەوە لە موهاجرین و ئەنسارو وخانەوادەکەی، ئەبوبەکر و عومەر وعەلیشی تێدابوون.

* پێغەمبەر ﷺ دەستیکردە بانگکردنی ئەوانەی هەڵهاتن:( بێن بۆلای من ئەی بەندەکانی خوا، من پێغەمبەرم، من محمدم).

* کەس بەدەم بانگەکەیەوە نەهات، پێغەمبەر ﷺ بە وشترەکەیەوە هێرشی بەرەو ڕووی هەوازن دەستپێکرد و ئەیفەرموو: (من پێغەمبەرم و درۆ نیە، من کوڕی عەبدولموتەلیبم).

* عەباسی مامی و ئەبوسوفیانی کوڕی حارسی ئامۆزای ڕەشمەی وشترەکەیان گرتبوو هێواشیان دەکردەوە لەخێرا ڕۆشتن بەرەو ڕووی دوژمن.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ دابەزی لە وشترەکەی و داوای سەرکەوتنی لەخوا دەکرد و دەیفەرموو: (خوایەگیان سەرکەوتنت دابەزێنە، خوایە گەر بتەوێ ئیتر ناپەرستریێ).

* پێغەمبەر ﷺ دەستیکردە کوشتار و ئەوانەشی کە لە گەڵیدا بوون، بەڵام ئەوان خۆیان دەدایە پشتی پێغەمبەرﷺ، لەبەر گەورەیی دامەزراوی و ئازایەتیەکەی لە نمونەی وەها هەڵوێستێکدا.

* عەلی ( ڕەزای خوای لێبێ) فەرمووی: (ئێمە گەر شەڕەکە توند بوایە و هەردوولا بگەشتنایە بەیەك خۆمان بە پێغەمبەر ﷺ دەپاراست).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بەعەباسی فەرموو (پیاوێکی دەنگ بەرزبوو). بانگی هاوەڵانی سەمورە بکە (یانی دارەکە).

* عەباس (ڕەزای خوای لێبێ) هاواریکردە ئەو هاوەڵانەی کە لەژێر دارەکە بەیعەتیاندا بە پێغەمبەرﷺ. کاتێ موسڵمانان دەنگەکەیان بیست گەڕانەوە.

* ئەگەڕانەوە و ئەیانوت: لبیك لبیك. هەتا کەسی وایان هەبوو گەر وشترەکەی پێچی نەکردایەتەوە جێی دەهێشت و بەرەو لای عەباس دەڕۆشت.

* کاتێ عەباس هاواریکردە هاوەڵانی سەمورە فەرمووی: ( واللە وەك بڵێی سۆز گرتبێتیان کاتێ دەنگیان بیستم. وەکو سۆزی مانگا بۆ بێچووەکانی. وەکو وەفایەك بۆ بەیعەتی ڕەزوان).

* خەڵکی شەڕێکی گەورەیان کرد و پێغەمبەر ﷺ چووە سەر وشترەکەی و پاشان فەرموی: (ئێستا شەڕەکە داگیرسا).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێ وردە بەردی هەڵگرت و فڕێیدا بەرووی کافراندا و فەرمووی: ( ناشرین ببن ئەم ڕووخسارانە)* هەموویان پڕی چاو و لوتیان بوو لەخۆڵ.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دۆڕان سوێن بەخوای کەعبە. دۆڕان سوێن بەخوای کەعبە).

پاشان خوای گەورە پشتیوانی پێغەمبەرەکەی ﷺ و موسڵمانانی کرد بە ناردنی فریشتەکان.

* خوای گەورە ئەفەرموێ: {سوێند بەخوا بەڕاستی خوا سەری خستن لەزۆر جێگا و شوێندا و لە ڕۆژی حونەینیشدا (یارمەتی دان) کە بەزۆری خۆتاندا دەنازین بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو بۆتان و زەویتان لەسەر تەنگ بوویەوە بەو فراوانیەی کە هەیەتی پاشان پشتان کردە دوژمن و هەڵهاتن}.

* فریشتە لە غەزای حونەیندا شەڕیان نەکرد. تەنها بۆ ترساندنی کافران دابەزین.

* فریشتە لە هیچ غەزایەك شەڕیان نەکردووە تەنها لە غەزای بەدری گەورەدا نەبێت. ئەویش وەکو تایبەتمەندییەکی ئەوغەزایە. هەروەکو جێگیربووە لە ئیبنوعەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێ) .

* کاتێ فریشتەکان دابەزین کافرەکان لە هەموو لایەکەوە هەڵهاتن *

* پێغەمبەر ﷺ هەواڵی خالدی پرسی. بینی بریندار بووە و ناتوانێ بجوڵێ.

* پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای وتفی دەکردە سەربرینەکەی و دەستی شەریفی پیادا دەهێنا تاوەکو چاك بوویەوە. ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ.

* موسڵمانان کەوتنە دووی کافران و لێیان دەکوشتن و دەگرتن. تاوەکو کافران شوێنی شەڕەکەیان چۆڵکرد و ماڵ و منداڵ و ژن و ئاژەڵەکانیان هەمووی جێهێشت.

* دەسکەوتی کافران هەمووی کەوتە دەستی موسڵمانان کەزۆر زۆر بوو: هەزار سەر وشتر و (٤٠) هەزار سەر مەڕ و (٤) هەزار ئۆقیە لە زیوی عەیارە ٢٤، جگە لە ژن و منداڵ.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد ئەم هەموو دەسکەوتە لە ناوچەی جیعرانە کۆبکرێنەوە، پێغەمبەر ﷺ پاسەوانی بۆ دانا.

* پێغەمبەر ﷺ دەسکەوتەکانی دابەش نەکرد، فەرمانیکرد بەشوێن کەوتنی کافرە هەڵهاتوەکان کە بەرەو تائیف هەڵهاتبوون.

* غەزای تائیف لە ڕاستیدا درێژکراوەی غەزای حونەین بوو، چونکە زۆربەی ئەوانەی لە هەوازن هەڵهاتبوون ڕۆشتبوونە تائیف و خۆیان لەوێ پەنادابوو.

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە تائیف و گەمارۆی دان و گەمارۆکە توندبوو لەسەریان، بەڵام هیچ ئاماژەیەك نەبوو بۆ فەتحی تائیف لەبەر سەختی قەڵاکانی.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ خەوێکی بینی، کە لە خەویدا مۆڵەت نەدرابوو بەفەتحکردنی تائیف، پاشان هەواڵی خەوەکەی بە خەڵکی ڕاگەیاند.

* پاشان بانگکەری پێغەمبەر ﷺ جاڕیدا بەڕۆشتن و جێهێشتنی تائیف، موسڵمانان وتیان: (دوعایان لێ بکە).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوایە هیدایەتی هۆزی دەوس بدە و بیانهێنە بۆ ناوئیسلام).

* پێغەمبەر ﷺ تائیفی جێهێشت بەرەو جیعرانە. لە ڕێگەدا سوراقەی کوڕی مالك پێی گەشت و موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد (ڕەزای خوای لێبێ) .

* پێغەمبەر ﷺ گەشتە جیعرانە و دەستیکردە دابەشکردنی دەسکەوت و بەشی سەرانی عەرەبیدا لە (١٠٠ ) وشتر وەکو ئەبوسوفیان و عویەینەی کوڕی حیسن.

* پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەم بەخشینە گەورەیەی دەدایە سەرانی عەرەب بۆ ئەوەی دڵیان ڕاگرێت لەسەر ئیسلام، چوون هێشتا لاوازی لە ئیسلامێتیاندا هەبوو.

* پێغەمبەر ﷺ بەشی هەموو عەرەبیدا لە دەسکەوت جگە لە ئەنسار .

* ئەنسارییەکان دەستیانکردە سکاڵا لەنێو خۆیاندا، گەورەی ئەنسار سەعدی کوڕی عوبادە ڕۆشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموو: ( ئەی پێغەمبەری خوا ئەنسار گلەییت لێدەکەن).

* پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ( ئەنسارم بۆ کۆبکەرەوە).

* ئەنسار کۆبونەوە و پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لایان و فەرمووی: (ئەی گرۆی ئەنسار هەندێ قسەی ئێوەم پێگەیشت، لە دڵی خۆتان لۆمەی منتان کردووە لەسەر ماڵی بێنرخی دونیا، من بەهۆیەوە دڵی قەومێکم ڕاگرت بۆئەوەی دامەزراوبن لەسەر ئیسلام، ئێوەشم داوە دەستی ئیسلامێتیەکەتانەوە، ئایا ڕازی نابن خەڵکی بە مەڕ و وشترەوە بڕۆنەوە و ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە)، ئەنسار دەستیان کردە گریان بە گریانێکی زۆر.

# گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان بۆ مەدینە و، ڕووداوەکانی دواتر تا غەزای تەبوک



* پێغەمبەر ﷺ ڕوونیکردەوە بۆ هاوەڵەکانی، کە حیکمەت لە دابەشکردنی دەسکەوتەکان و بەخشینی بە هەندێك و نەبەخشینی بەهەندێکی تر.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من ئەبەخشمە کەسانێ لە ترسی ناتەواوی و دانەمەزراوی، کەسانێکی تریش ئەسپەردەی ئەوە دەکەم خوا خستویەتە دڵیانەوە لە چاکە و دڵ دەوڵەمەندی).

* دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لێبویەوە لە دابەشکردنی دەسکەوتەکان، بەشەو نیەتی عومرەی لێهێنا لە جیعرانەوە. بەم عومرەیەش ئەوترێ عومرەی جیعرانە .

* پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە بەسەرکەوتوویی و پشتیوانی لە خواوە. لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٨)ی کۆچی گەشتەوە مەدینە.



* ماریەی قیبتی کەنیزەکێك بوو، مقەوقس پاشای قیبتیەکان بە دیاری بەخشیە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ ئەڕۆشتە لای وەکو کەنیزەکێ نەك خێزانی.

* لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٨)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی لە ماریە بوو لە ناوچەی عالیە.

* ئەنەس ئەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەمشەو کوڕێکم بوو، بەناوی باوکم ئیبراهیمەوە ناوم نا) (موسلم گێڕاویەتیەوە).

* ژنانی ئەنسار پێشبڕکێیان دەکرد کە ببنە شیردەری ئیبراهیم، چونکە دایکی (ماریەی قیبتی) کەم شیربوو، پێغەمبەر ﷺ خستیە لای ئوم سەیف.

* ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرمووێ: (کەسم نەبینیوە وەکو پێغەمبەر ﷺ بەرەحم بێت بەرامبەر منداڵی خۆی، زۆرجار ئەڕۆشتە لای ئیبراهیمی کوڕی و ماچی ئەکرد و لە باوەشی ئەگرت).

* ساڵی (٩)ی کۆچی هات، ئەو ساڵەی نوسەران و توێژەرانی ڕێژین و غەزاکانی پێغەمبەر ﷺ بە ساڵی وەفدەکان ناوی دەبەن.

* پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ساڵی (٩)ی کۆچی دانیشت و پێشوازی لەوەفدەکان دەکرد.

* ئەو وەفدانەی کە هاتن، سەرانی هۆزەکان بوون بۆ ئاشکراکردنی ئیسلامەتیان.

* ژمارەیان دەگەشتە زیاتر لە (٦٠) وەفد. لەوانە: وەفدی باهیلە و وەفدی بەنی تەمیم و وەفدی بەنی ئەسەد و وەفدی بەجیلە و ئەحمەس و جگە لە مانەش وەفدەکانی تر.

❊ له مانگی ڕەجەبی ساڵی (٩)ی کۆچی نەجاشی (ئوسحومە) پاشای حەبەشە کۆچی دوایی کرد و پێغەمبەر ﷺ نوێژی غائیبی لەسەرکرد (ڕەزای خوای لێبێ) .

❊ جابری کوڕی عبدالله ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەمرۆ پیاوێکی چاك وەفاتی کرد هەستن نوێژ لەسەر براکەتان بکەن. ئوسحومە) ( شەیخەین گێڕاویانەتەوە)❊

❊ ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: (پێغەمبەرﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی پاشای حەبەشەی گەیاند لە ورۆژەی تیایدا وەفاتیکرد و فەرمووی: داوای لێخۆشبون بۆ براکەتان بکەن).

❊ جابری کوڕی عبدالله ئەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی کرد و ڕیزبووین لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ من لە ڕیزی دووەم یان سێیەم بووم).

❊ له مانگی ڕەجەبی ساڵی (٩)ی کۆچی، کۆتا غەزای پێغەمبەر ﷺ ڕوویدا، غەزای تەبوك. کە نزیکەی (٧٠٠) کلم لە مەدینەوە دوورە❊

❊ ئەم غەزایە لەگەڵ گەورەترین دەوڵەتی ئەوکاتی جیهاندا بوو. دەوڵەتی ڕۆم. پێغەمبەرﷺ فەرمانیکرد بە هاوەڵەکانی خۆیان ئامادەبکەن بۆ غەزای ڕۆم.

❊ کاتی غەزای تەبوك لە بارودۆخێکی زۆر نارەحەتدا بوو. گەرمی ودووری ڕێگا، هەر لەبەر ئەمەشە پێشی ئەوترێ غەزای عوسرە.

* دەرچوون بۆ غەزای تەبوك بەخۆویستی نەبوو، بەڵكو واجب بوو لەسەر هەمووو موسڵمانێ كە دەرچێ بۆ ئەم غەزایە، مەگەر كەسێ عوزری هەبێ، وەكو نەخۆشی و شتی تر.

* پێغەمبەر ﷺ هانی هاوەڵانی دەدا لەسەر بەخشین بۆ ئامادەكردنی سوپای عوسرە، هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لێبێ ) پێشبڕكێیان دەكرد لە ماڵ بەخشیندا.

* ئەبوبەكر(ڕەزای خوای لێبێ) هەمووو ماڵەكەی هێنا و بەخشیە سوپای عوسرە، عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) نیوەی ماڵەكەی هێنا و بەخشیە سوپای عوسرە .

* عوسمان (ڕەزای خوای لێبێ) بەخشینێكی زۆر گەورەی بەخشیە سوپای عوسرە كە هاوشێوەی نەبیسترابوو.

* كاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەم بەخشینە گەورەیەی لە عوسمان بینی زۆر دڵی خۆشبوو، فەرمووی: (عوسمان لە ئەمڕۆ بەدواوە هەر كردارێ بكا زەرەری لێنادا).

* عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف (ڕەزای خوای لێبێ) (٨٠٠ هەزار) درهەمی هێنا و بەخشیە سوپای عوسرە .

* ئا بەم شێوەیە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) یەك لەدوای یەكماڵی خۆیان ئەبەخشی بۆ ئامادەکردنی سوپای عوسرە .

* کاتێ مونافیقەکان ئەم بەخشینەی هاوەڵانیان بینی دەستیانکردە گاڵتە کردن پێیان.

* ئەگەر دەوڵەمەند ببیبەخشیبایە ئەیانوت ئەمە بۆ بەرچاوی و ڕیا ئەیبەخشێ. ئەگەر هەژار ببیبەخشیبایە ئەیانوت خوا پێویستی بەم ماڵە کەمە نیە.

* دەربارەی مونافیقەکان ئەم ئایەتە دابەزی: {ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بە ویستی خۆیان لە ڕێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە ڕەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت. ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن. ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ڕیسوایان دەکات. بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بە شیانە} (سورەتی تەوبە:٧٩) .

* ژمارەیەك لە هاوەڵان کە ڕاستگۆ و سەرڕاست بوون دواکەوتن لەم غەزایە بەبێ هۆ. کەسانی ڕاستگۆش بوون و تۆمەتبار نەدەکران لە ئیسلامێتیاندا .

* ئەوانیش :

١ ـ کەعبی کوڕی مالك .

٢ ـ هیلالی کوڕی ئومەیە .

٣ ـ موراڕەی کوڕی ڕەبیع .

٤ ـ ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر و جگە لەمانیش (ڕەزای خوایان لێبێ).

* پێغەمبەر ﷺ بە سوپاکەیەوە کە ژمارەیان دەگەشتە (٣٠ هەزار) جەنگاوەر دەرچوون، ئەمەش گەورەترین سوپایە لەساتی پێغەمبەرایەتیەوە.

* پێغەمبەر ﷺ لەدوای خۆی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبی دانا لەسەر خانەوادەکەی و فەرمانی پێکرد لەناویانا بمێنێتەوە.

* عەلی (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموی: (لەناو منداڵ و ژناندا ئەمکەی بەشوێنگرەوەت ؟)

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەوە ڕازی نابی بۆمن وەکو هارون بیت بۆ موسی، تەنها ئەوە نەبێ لەدوای من پێغەمبەری تر بوونی نیە).

* پێغەمبەر ﷺ بەسوپا گەورەکەیەوە بەڕێکەوت و لە سەنیەتولوەداع سەربازگەی دانا و لەوێ سوپاکەی ڕێکخست و ئاڵاکانی دابەشدەکرد.

* ژمارەیەکی زۆریش لە مونافیقەکان لەناو سوپاکەی پێغەمبەر بوون.

* پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگادا بەرەو تەبوک دای بەلای حیجر (وڵاتی سەمود) قەومی صالح (علیه السلام)، خێرا پێیدا تێپەڕی.

* پێغەمبەر ﷺ نزیك لە وڵاتی سەمود پشوویدا بە سوپاکەی، بەڵام نەڕۆشتە ناویەوە، خەڵکانێ لە بیرێك ئاوی ئاژەڵەکانیاندا و هەویریان پێیکرد.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ پێی زانین، فەرمووی: (مەڕۆنە ناو ئەوقەومەوە کە خوای گەورە سزای دان، چونکە من ئەترسم تووشی ئەوە ببن کە تووشی ئەوان بووە).

* پاشان فەرمانی پێکردن لە بیری ئاو نەخۆنەوە و ئاو بەئاژەڵەکانیان نەدەن، وتیان: هەویرمان لێکردووە و ئاوی ئاژەڵەکانمان هێناوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن ئەو هەویر و ئاوە فڕێدەن.

* لە ڕێگادا بەرەو تەبوک سوپاکە بەشەو لایاندا بۆ پشوودان، نەختێ پێش نوێژی بەیانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ ئەوەی دەسێ بەئاو بگەیەنێ، موغیرەی کوڕی شوعبەشی لەگەڵدا بوو.

* پێغەمبەر ﷺ دواکەوت لە گەڕانەوەی بۆلای هاوەڵان، هاوەڵانیش عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیان خستە پێشەوە بۆ پێشنوێژی کردن.

* کاتێ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف گەشتە ڕکاتی دووەم پێغەمبەر ﷺ گەیشت و ڕکاتێکی بە جەماعەت کرد و ڕکاتێکیشی بەتەنها، ئەنجامدا.

* کاتێ عەبدوڕەحمان سەلامی دایەوە و پێغەمبەری بینی کە ڕکاتێکی لەدەستچووە و خەریکە تەواوی دەکات، شتێ کەوتە دڵی هاوەڵانەوە ( ڕەزای خوایان لێبێت).

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە پێیانی فەرموو: (چاکتان کرد، یان پێکاتان).

* پێغەمبەر ﷺ دانینا بەوەی کە چاوەڕێیان نەکرد لەبەر لەدەست نەچوونی کاتی یەکەمی نوێژدا.

بەڵام فەرموودەی: (هیچ پێغەمبەرێ نەمردووە تا لەپشتی پیاوێکی چاك لە ئوممەتەکەی نوێژ نەکات). (ئەحمەد و ئیبنوسەعد لە تەبەقاتەکەی هێناویانە. بەڵام فەرموودەیەکی لاوازە).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕێگاکەی تەواو دەکرد بەرەو تەبوك. بە هاوەڵانی فەرموو: (إن شاء الله سبەی دەگەنە کانی تەبوك. هەرکەس ڕۆشتە سەری بادەستی لێنەدا تاخۆم دێم).

* کاتێ موسڵمانان گەشتنە تەبوك. بینیان کانیەکەی ئاوی کەمە و دوو پیاو لە موونافیقەکان خەریکن ئاوی لێ ئەبەن لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردبوون.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ بینی دوو پیاو پێشی کەوتوون لە گەشتن بە کانیاوەکەی تەبوك ولەئاوەکەیان بردووە. نەفرەتی لێکردن. پاشان پێغەمبەر ﷺهەردوو دەست و ڕوخساری لە ئاوی تەبوك شۆردەوە.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بەموعازی کوڕی جەبەلی فەرموو: (نزیکە گەر تەمەنت درێژ ببێ. ببینی ئەم ناوە هەمووی پڕبوبێ لە سەوزایی و باخچە).

* خێمەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ لێدرا و (٢٠) ڕۆژ لە تەبوك مایەوە. هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ دوژمندا ڕووی نەدا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ دەستیکرد بە ناردنی سریە بەرەو هۆزەکانی دەوروبەری شام. هەروەها نامەیەکی نارد بۆ قەیسەر پاشای ڕۆم .

* پێغەمبەر ﷺ ئاگربەستی کرد لەگەڵ خەڵکی ئەیلە و جولەکەی جەرباء و ئەزروح.

* پێغەمبەر ﷺ خالدی کوڕی وەلیدی بە٤٥٠ کەسەوە نارد بۆ ئوکەیدری دومەتولجەندەل.

* ئوکەیدری دومەتولجەندەل ئاگربەستی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا لەسەر سەرانە. ئوکەیدر ئێسترێکی بە دیاری بەخشیە پێغەمبەرﷺ. لەگەڵ جوبەیەك لە ئاوریشمی تەنك کە زێڕی تێدابوو.

* هاوەڵان سەریان سوڕما لە جوانی جوبەکە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (سەرتان سوڕما لە نەرمی ئەمە ؟ واللە دەستەسڕەکانی سەعدی کوڕی موعاز لە بەهەشتدا باشتر و نەرمترە).

* پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە دحیەی کەلبیدا نارد بۆ قەیسەر، پاشای ڕۆم بانگی دەکرد بۆ سێ خاڵ: یان موسڵمان بوون یان سەرانەدان. یان شەڕکردن.

* قەیسەر سەرکردەکانی ڕۆمی کۆکردەوە و نامەکەی پێغەمبەری خوێندەوە بۆیان.

وتیان: واللە ناڕۆینە ناو دینەکەیەوە و سەرانەش نادەین و شەڕیشی لەگەڵدا ناکەین.

* پاشان قەیسەر ئەمەی بەنامەیەکدا نارد بۆ پێغەمبەرﷺ . ئەویش بەمە وازی لێهێنان. ئیدی عەرەب بیستیان ڕۆم لە جەنگی پێغەمبەر ﷺ دەترسێ.

* پێغەمبەر ﷺ دوای (٢٠) ڕۆژ مانەوە لە تەبوك گەڕایەوە مەدینە.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە دۆڵی قورا. بە هاوەڵانی فەرموو: (من پەلە ئەکەم بۆ گەشتنە مەدینە. هەرکەس لەئێوە ئەیەوێ پەلەبکات لەگەڵ من باببیکات).

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە زی بوان. وەحی دابەزی وهەواڵی پێدا بەبنیاتنانی مزگەوتی زیرار لەلایەن مونافیقەکانەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بیرۆخێنن.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو:( لەڕاستیدا کەسانێ هەن لە مەدینەن. ئێوە هەرشوێنێ ڕۆشتبێتن و هەردۆڵێکتان بڕیبێ. ئەوانیش لە پاداشتەکەیدا لەگەڵتانن. چونکە عوزر ڕێگربوو لە هاتنیان).

* کاتێ مەدینەی لێوەدەرکەوت فەرمووی: (ئەمە تەیبەیە یا تابەیە).

* کاتێ خەڵکی بیستیان پێغەمبەر ﷺ گەڕاوەتەوە. دەرچوون بەرەوپیری تا سەنیەتولوەداع بەخۆشیەکی ئێجگار زۆرەوە.

* سائیبی کوڕی یەزید ئەفەرموێ: (بیرم دێ لەگەڵ منداڵاندا دەرچووین بەرەوپیری پێغەمبەر ﷺ بۆ سەنیەتولوەداع). (بوخاری گێڕاویەتیەوە).

* خەڵکی لە غەزای تەبوك. بوون بەچوار بەشەوە:

١- فەرمان پێکراوی پاداشتدراو: وەکو عەلی و محمدی کوڕی مەسلەمە و ئیبنوئومی مەکتوم .

٢- بیانوو داران :لاوازەکان ونەخۆشەکان.

٣- سەرپێچیکارە تاونبارەکان: وەکو ئەو سێ هاوەڵەی دواکەوتن و نەڕۆشتن.

٤- لۆمەکراوەکان: کە مونافیقەکان بوون.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بە هەجرکردن (پچڕاندنی پەیوەندی) لەگەڵ هەموو ئەوانەی نەهاتبوون بۆ غەزاکە و بیانوو (عوزر) یان نەبوو.

* پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران پشتیان لێهەڵکردن.

* دەشتەکییەکان هاتن و بیانویان هێنایەوە بە کۆمەڵی بیانوی پووچەوە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرتن و نییەتی دڵیشیانی (نیازی شاراوەیان) ڕەوانەی لای خوا کرد.

* پێغەمبەر ﷺ ئیشی ئەو سێ کەسەی دواخست کە ڕاستگۆ بوون و بەبێ هیچ بیانوویەك ئامادەی غەزاکە نەبوون.

* ئەوانیش: کەعبی کوڕی مالك و هیلالی کوڕی ئومەیە و موراڕەی کوڕی ڕەبیع بوون ( ڕەزای خوایان لێبێ) .

* ئەم سێ هاوەڵە بەڕێزە دانیان نا بەوەی کە بەبێ بیانوو دواکەوتن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ.

* خوای گەورە دەربارەی ئەم سێ هاوەڵە ئەفەرموێ: { لە بەجێ ماوەکاندا کەسانێکی تر هەبوون کە دواخران بۆ فەرمان و بڕیاری خوا یان سزایان دەدات یان پەشیمانیان لێ وەردەگرێ وە خوا زانای کار دروستە}.

※ خوای گەورە تەوبەی لەو سێ هاوەڵە وەرگرت کە دواکەوتبوون لە غەزای تەبوك بەبێ بیانوو، لەبەر ڕاستگۆییان (ڕەزای خوایان لێبێ).

※ خوای گەورە تەوبەکەیانی لە قورئاندا دابەزاند. خوا ئەفەرموێ: {هە روەها (خوا تەوبەی وەرگرت) لەو سێ کەسەش کە دواخران (خوا دەربارە یان بڕیاری نەدابوو) هەتا ئەو کاتەی زەوی لێیان تەسك بوویە وە بەو فراوانیەی کە هەیەتی و بێزاربوون لە گیانی خۆشیان و زانیان هیچ پەناگە یەك نی یە لە (سزای) خوا مەگەر پەنایی خۆی پاشان پە شیمانی لێ وە رگرتن بە دابەزاندنی چەند ئایەتێك (بۆ ئەوەی تۆبە بکەن بەڕاستی خوا هەمیشە تۆبە وەرگری میهرەبانە)}.

# ڕووداوەکانی دوای غەزای تەبوک تا حەجیماڵئاوایی



* دوای کۆتا غەزای پێغەمبەر ﷺ کە غەزای تەبوک بوو، بارودۆخەکە لە مەدینە سەقامگیربوو خەڵکی بەخێرایی دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، بۆ ئاشکراکردنی ئیسلامێتیان .

* لەکۆتاییەکانی ساڵی (٩)ی کۆچی ئوم کلسومی کچی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خوای لێبێ).

* هەروەها لە هەمان ساڵدا سەرکردەی مونافیقەکان عەبدوڵای کوڕی سەلول کۆچی دوایی کرد.

* لە کۆتاییەکانی مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٩)ی کۆچی پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری بە ئەمیرێتی حەج نارد بۆئەوەی حەج بە موسڵمانان بکات.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ئەبوبەکر ئەمانە لە حەجدا ڕابگەیەنێ: ( لەمساڵ بەدواوە هیچ موشریکێ بۆی نیە حەج بکات، کەس بۆی نیە بەڕووتی تەواف بکات، تەنها باوەڕدار دەچێتە بەهەشتەوە).

* له مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (١٠)ی کۆچی ئیبڕاهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد. تەمەنی (١٨) مانگ بوو.

* پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای تەرمەکەی و چاوەکانی فرمێسکیان دەڕژاند.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( ئیبڕاهیمی کوڕم لە کاتی شیرەخۆریدا وەفاتیکرد. دوو ئافرەتی شیردەری بەسۆز لەبەهەشتدا کاتی شیرخواردنەکەی بۆ تەواو دەکەن).

* ئیبراهیم له گۆڕستانی بەقیع نێژرا.

* ئەو ڕۆژەی ئیبراهیم کۆچی دوایی کرد خۆرگیرا. خەڵکی وتیان: خۆرگیرا لەبەر مردنی ئیبڕاهیمی کوڕی پێغەمبەرﷺ !

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن له نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا، بۆ مردن و لەدایکبوونی کەس ناگیرێن، ئەگەر بینیتان گیران نزا و پاڕانەوە بکەن و نوێژ بکەن).

* له مانگی زیلقەعدەی ساڵی (١٠)ی کۆچی بانگەواز کرا بەناو خەڵکیدا کە پێغەمبەر ﷺ ئەیەوێ ئەمساڵ حەج بکات .

* جابر ئەفەرموێ: (خەڵکێکی زۆر زۆر هاتبوون بۆ مەدینە وهەموویان ئەیانویست چاو لە پێغەمبەر ﷺ بکەن* هەروەها جابر ئەفەرموێ: کەس نەبوو بتوانێ بێت و نەهاتبێ ؟)

* ئەم حەجە بە حەجی ماڵئاوایی ناونرا. چونکە پێغەمبەرﷺ تیایدا ماڵئاوایی لە خەڵکی کرد و ئیتر حەجی نەکردەوە.

* لەم حەجە پیرۆزەدا زیاتر لە (١٠٠) هەزار کەس لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەبوون.

* پێغەمبەر ﷺ هەر (٩) خێزانەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنا ( ڕەزای خوایان لێبێ) .

* پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ زیلحولەیفە میقاتی خەڵکی مەدینە غوسلی کرد بۆ ئیحرام پۆشین، پاشان دایکە عائیشە بۆنخۆشی کرد.

* لە مییقاتی زیلحولەیفەدا ئەسمائی کچی عومەیس خێزانی ئەبوبەکر کوڕێکی بوو بەناوی محمد.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ تەلبیەی کرد و هاوەڵانیش تەلبیەیان کرد (ڕەزای خوایان لێبێ) .

* پێغەمبەر ﷺ بەقیڕان حەجی کرد (واتە عومرەی کرد و ئیحرامی لانەدا تا حەجیشی کرد).

* کاتێ گەشتنە سەریف دایکە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) تووشی حەیز بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد هەموو ئەرکانەکان بکات تەنها تەواف نەبێ.

* پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی یەك شەممە لە (٥)ی زیلقەعدە گەشتە مەککە. لە سپێدەی ڕۆژی یەك شەممە ڕۆشتە ناو مزگەتی حەرامەوە .

* پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای عەبدمەنافەوە ڕۆشتە ناو مزگەوتی حەرامەوە کە ناسراوە بە دەرگای بەنی شەیبە. ئێستا پێی ئەوترێ دەرگای سەلام. پاشان عومرەی ئەنجامدا ﷺ.

* کاتێ لە عومرە لێبویەوە لە ئەبتەح دابەزی خۆرهەڵاتی مەککە*

* کاتێ ڕۆژی (٨)ی زیلحیجە هات کە ڕۆژی تەرویەیە. کەوتەڕێ بەرەو مینا.

* پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و شێوان و عیشای لە مینا کرد. لە ڕۆژی پێنجشەممە (٨)ی زیلحیجە. هەروەها نوێژی بەیانی (٩)ی زیلحیجەیش.

* کاتێ خۆرهەڵهات لەبەیانی ڕۆژی (٩)ی زیلحیجە. پێغەمبەرﷺ کەوتەڕێ بەرەو عەرەفە تاوەکو خۆر لایدا لە ناوەڕاستی ئاسمان (زەوال). گەشتە ناودۆڵەکە لە زەوی عەرنە.

* لەوێدا وتارە بەناوبانگەکەی فەرموو. وتاری عەرەفە لەسەر وشترەکەی (قەسواء) ەوە بوو.

* پێغەمبەر ﷺ وتارێکی گەورەیدا و تیایدا بنەماکانی ئیسلامی جێگیرکرد و بنەماکانی جاهیلیەتی هەڵوەشاندەوە.

* لێرەدا ناکرێ باسی وتارە گەورە و بەنرخەکەی پێغەمبەر بکەین. هەرکەس ویستی لێبوو با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی لوئلوئی مەکنون.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەی بووەوە نوێژی نیوەڕۆ وعەسری بەکۆ و کورتکراوی( قەسروجەمع) ئەنجامدا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بەسواری وشترەکەیەوە کەوتەڕێ تاگەشتە مەوقیف، ئیدی لەوێ ڕوویکردە قیبلە و دەستیکردە نزاوپاڕانەوە تا خۆرئاوابوو.

* پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی ڕاگەیاند کە باشترین دوعا دوعای ڕۆژی عەرەفەیە.

* پێغەمبەر ﷺ هەر لەعەرەفە بوو ئەم ئایەتەدابەزی: {اليوم أكملت لكم دينكم}. واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ کامڵ و تەواوکرد.

* کاتێ خۆر تەواو ئاوابوو پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە هاتە خوارەوە بۆ موزدەلیفە.

* پێغەمبەر ﷺ نوێژی شێوان و عیشای بەکۆ و کورتکراوی ئەنجامدا و پاشان ڕاکشا تا بەیانی پاشان نوێژی بەیانی کرد لە ڕۆژی سەربڕین، ڕۆژی حەجی گەورە.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ بە سواری وشترەکەیەوە ڕوویکردە قیبلە و دەستیکردە نزاوپاڕانەوە، تەکبیر و تەهلیل و خوا بەیەك گرتن، تاوەکو تەواو دونیا ڕۆشن بووەوە.

* پێغەمبەر ﷺ سەر لە بەیانی ڕۆژی سەربڕین (نەحر) فەرمانیکرد بە ئیبنوعەباس بەردی ڕەجمکردنی بۆ بێنێ، ئەویش (٧) بەردی بچوکی بۆهێنا.

* پاشان پێغەمبەر ﷺ لە مەشعەری حەرامەوە پێش خۆرکەوتن کەوتەڕێ بەپێچەوانەی موشریکەکان کە دوای خۆرکەوتن دەکەوتنەڕێ.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە لای جەمرەی عەقەبەی گەورە لە خوارەوەی دۆڵەکە وەستا و بەیتی خستە لای چەپیەوە و مینایشی خستە لای ڕاستیەوە و بەسواری وشترەکەیەوە ڕوویکردە جەمرەی عەقەبە.

* کاتەکەی کاتی چێشتەنگاو بوو، هەر حەوت بەردەکەی بەدانە دانە تێگرت و لەگەڵ هەر بەرد فڕێدانێکدا الله أکبری ئەکرد و ئەیفەرموو: (ئەرکانەکانی حەج وەرگرن).

* پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ شوێنی سەربڕین لە مینا و بەدەستی شەریفی (٦٣) وشتری سەربڕی و کردیە قوربانی.

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە قوربانیکردن بویەوە، بانگی سەرتاشی کرد و سەری شەریفی تاشی، مەعمەری کوڕی عەبدوڵای عەدەوی سەری تاشی (ڕەزای خوای لێبێ) .

* ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( بینیم کاکی سەرتاش سەری پێغەمبەری دەتاشی و هاوەڵەکانیشی بەدەوروبەریدا دەسوڕانەوە و هەرلایەکی سەری دەتاشی دەکەوتە دەستی هاوەڵەکانی).

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ سەری شەریفی تاشی، قەمیسی لەبەرکرد و بۆنی خۆشی بەکارهێنا.

# گەڕانەوە لە حەج و ڕووداوەکانی دواتر تا ساتی وەفاتی ﷺ



* پاشان پێغەمبەر ﷺ سواری وشترەکەی بوو، پێش نیوەڕۆ گەڕایەوە بەیت وهەر بەسواری وشترەکەیەوە تەوافی ئیفازەی کرد بۆئەوەی خەڵکی بیبینن.

* پاشان هاتە لای بیری زەمزەم و لێی خواردەوە و پاشان هەر لەوڕۆژەدا گەڕایەوە مینا.

* پێغەمبەر ﷺ (٣) ڕۆژەکەی ڕۆژانی تەشریق دوای زەوال ئەهاتە لای جیمارەکان و شەیتان ڕەجمی دەکرد .

* پێغەمبەر ﷺ حەجە موبارەکەکەی کۆتایی پێهێنا بە تەوافی ماڵئاوایی (وەداع) و ئەیفەرموو: (کەس نەڕواتەوە بۆ شوێنی خۆی تاوەکو کۆتا سەردانی بەیت نەکات). (شەیخەین گێڕاویانەتەوە)

* پاشان پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە و هەندێکی کەم لە ئاوی زەمزەمی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

* ئەمە بە شێوەیەکی کورت و پوخت حەجی پێغەمبەربوو.

* له ڕۆژی دووشەممەی (٢٦)ی مانگی سەفەر، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بە هاوەڵەکانی خۆیان ئامادەبکەن بۆ غەزای ڕۆم

* پێغەمبەر ﷺ ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە سەرکردەی سوپاکە (ڕەزای خوا لەخۆی وباوکیشی بێت).

* تەمەنی ئوسامە تەنها (١٨) ساڵ بوو، لەناو سوپاکەشدا گەورە هاوەڵانی وەکو عومەر و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس و ئەبوعوبەیدەی تێدابوو (ڕەزای خوایان لێبێ ).

* خەڵکی لەبەر کەمی تەمەنی ئوسامە تانەیان لە سەرکردایەتیەکە دەدا بۆ وەها سوپایەکی گەورە .

* دەنگوباسی ئەم گلەیی و گازندەییانە گەشتەوە پێغەمبەر ﷺ

* کاتێ بانگەوازی ئیسلام کامڵ بوو، هەروەها ئیسلام دەسەڵاتی گرتەسەر هەموو جەزیرەی عەرەبی و خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، پێغەمبەر ﷺ هەستی بەنزیکی ئەجەلی (کاتی مردنی) خۆی دەکرد.

* نیشانەکانی نزیکبوونەوەی ئەجەلی پێغەمبەر ﷺ :

١- دابەزینی سورەتی نەسر.

٢- پێداچونەوە و خوێندنەوەی قورئان.

٣- زۆری عیبادەت کردنی.

٤- دووبەرابەرکردنی ئیعتیکاف کردنی لە ڕەمەزاندا.

* نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ دەستیپێکرد. ئەو نەخۆشیەی کە بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد.

* لە کۆتاییەکانی مانگی سەفەر نەخۆشیەکەی دەستیپێکرد و سەرەتا بەسەر ئێشەیەکی توند دەستیپێکرد .

* کاتی نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ (١٣) ڕۆژی خایاند. سەرەتا لای دایکە عائیشە بوو (ڕەزای خوای لێبێ). پاشان پێغەمبەر ﷺ ویستی بگەڕێ بەسەر هەموو خێزانەکانی تریدا (ڕەزای خوایان لێبێ).

* بەڵام کاتێ گەشتە لای دایکە مەیمونە نەخۆشیەکەی زۆر توند بوو. مۆڵەتی خواست لە خێزانەکانی کە لای عائیشە چاودێری بکرێ. ئەوانیش مۆڵەتیان دا (ڕەزای خوا لەهەموویان بێ).

* نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆر توند بوو لە ماڵی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ). تای زۆر توندی لێنیشت و پلەی گەرمی جەستەی زۆر بەرزبوویەوە.

* ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( ئەی پێغەمبەری خوا تایەکە چەند توندە لەسەرت) !

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بەڵێ ئێمە واین و بەڵاکە چەند بەرابەر ئەبێ لەسەرمان و پاداشتەکەمانیش بۆ دوو بەرابەر ئەبێ).

* کاتێ پێغەمبەر ﷺ نەخۆشیەکەی لەسەر قورس بوو. ئیدی نەیتوانی بڕوات بۆ مزگەوت و پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد ئەبوبەکر پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات.

* پێغەمبەر ﷺ هەستی بەسوکیەك کرد لە نەخۆشیەکەیدا، بە پاڵدانەوە بەسەر فەزڵی کوڕی عەباسی ئامۆزایدا ڕۆشتە مزگەوتەوە و چووە سەر مینبەر و کۆتا وتاری بۆ موسڵمانان دا.

* پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەیدا باسی فەزڵ و چاکەی ئەبوبەکر و ئەنساری کرد.

* هەروەها باسی فەزڵی ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد و ڕوونیکردەوە کە شایەنی سەرکردایەتی ئەو سوپایەیە.

* ڕیوایەتکراوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ خۆی خستۆتەڕوو بۆ تۆڵە لێوەرگرتنی، بەڵام سەنەدەکەی زۆر لاوازە و جێگیر نیە.

* پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەیدا هۆشداری داوە ئوممەتەکەی کە گۆڕەکەی بکرێتە مزگەوت.

* هەروەها هەواڵی دائێ کە خراپترینی خەڵکی ئەوانەن کە گۆڕی پێغەمبەرەکەیان دەکەنە مزگەوت.

* پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوایە گۆڕەکەم نەکەیتە بتێك و بپەرسترێ، نەفرەتی خوا لەو قەومەی گۆڕی پێغەمبەرەکەیان کردۆتە بۆنە و جەژن). (ئەحمد گێڕاویەتیەوە)

* ئیبنولقەییم ئەفەرموێ: ئەمە نەهی پێغەمبەری خوایە بۆ ئوممەتەکەی کە گۆڕەکەی بکەنە شوێنی گردبوونەوە، وەکو جەژنەکان و بۆنەکان، خەڵکی بەنیازی ئەوێ کۆببنەوە بۆ نوێژکردن و نزاوپاڕانەوە .

* پێغەمبەر ﷺ هەرسوربوو لەسەرئەوەی کە خۆی پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات لەگەڵ ئەوەشداکە نەخۆشبوو.

* بەڵام نەخۆشیەکەی توندبوو لەسەری و ئیتر نەیدەتوانی بڕوات بۆ مزگەوت.

* لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیکرد بە ئەبوبەکر پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات .

* ٣ ڕۆژ پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەسێتی کرد بۆ ئوممەتەکەی کە گومانی باش بەخوا بەرن. فەرمووی: ( کەس لە ئێوە نەمرێ مەگەر گومانی باش بەخوا ببات).

* پێشەوا نەوەوی ئەفەرموێ: لەم فەرموودەیەدا هۆشداری تێدایە بە نائومێدی. مانای گومانی باش بەخوا ئەوەیە کە گومان بەری خوا ڕەحمت لێبکاو و لێت خۆشبێ.

* پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بەدوو ڕۆژ، سوکیەکی لە نەخۆشیەکەی بینی و دەرچوو بۆ مزگەوت لەنێوان دووکەسدا و پێیەکانی شەریفی دەخشان بە زەویدا لەبەر توندی نەخۆشیەکەی .

* بینی ئەبوبەکر نوێژ بۆ خەڵکی دەکات. کاتێ ئەبوبەکر هەستی پێکرد ویستی بگەڕێتە دواوە. بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆکرد کە لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە.

* پێغەمبەر ﷺ لەلای چەپی ئەبوبەکرەوە دانیشت .

* ڕۆژێ پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ نەخۆشیەکەی زۆر توند بوو. هەواڵ گەشتە سوپاکەی ئوسامە (ڕەزای خوای لێبێ) گەڕایەوە بۆ مەدینە.

* پێغەمبەر ﷺ شەوی دووشەممە نەخۆشیەکەی تەواو لەسەر قورسبوو تا نزیکی مردن. بەڵام کاتێ خۆرهەڵهات هۆشی هاتەوە و نەختێ باشتربوو.

* پێغەمبەر ﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا و بینی موسڵمانان لەڕیزدا وەستاون و نوێژ ئەکەن، دڵیخۆشبوو زەردەخەنەیەکی کرد.

* ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( ڕووخساری پێغەمبەرﷺ وەکو پەڕەی قورئان بوو). ئەمە لێکچواندنی ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ بەجوانیەکی زۆر، ویستمان نوێژەکەمان ببڕین لەخۆشی بینینی پێغەمبەرداﷺ .

* کاتێ خەڵکی بینیان پێغەمبەر ﷺ بەیانی نەختێ باشتربووە و هۆشی هاتووە گومانیان وابوو لە نەخۆشیەکەی چاکبۆتەوە. بۆیە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان و بۆ سەر ئیش وکار و پێداویستیەکانیان.

* ئەبوبەکریش مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر ﷺ کە بگەڕێتەوە بۆ لای خێزانەکەی لە ناوچەی سونح لە عەوالی مەدینە. پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی دا.

* کاتێ سپێدەی بەیانی (١٢)ی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (١١)ی کۆچی کەوتە ئێش و ئازارەکەی زیاتر و زیاتر توند بوو لەسەری ( گیانم فیدای بێ).

* فاتیمەی کچی فەرمووی: (داخی سەختم بۆ باوکی خۆشەویستم). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لەمڕۆوە ئیتر ناڕەحەتی تووشی باوکت نایەت. شتێك بەسەر باوکت دا هاتووە کەس لێی دەرباز نابێت).

* له کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نارەحەت دەبوو بەهۆی سەرەمەرگەوە. عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) سەری شەریفی خستبووە سەر سینەی خۆی.

* دەفرێکی ئاو لەبەردەستی پێغەمبەر ﷺ بوو، پێغەمبەر ﷺ دەستی دەخستە ئاوەکەوە و ئەیفەرموو: ( لا إله إلا الله بەڕاستی مردن نارەحەتی هەیە).

* پاشان دەستی ڕاستکردەوە بۆ ئاسمان ﷺ و هەر ئەیفەرموو: (في الرفيق الأعلى).

پاشان وەفاتیکرد و دەستی شل بویەوە.

* لە ریوایەتێکدا هاتووە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: (داوای تەشتێ ئاوی کرد و لاربوویەوە لە کۆشمدا، هەستم پێنەکرد کە مردووە).

* لە گێڕانەوەکەی ئەحمەددا هاتووە، عائیشە ئەفەرموێ: (لە کاتێکدا سەری لەسەرشانم بوو، لەپڕ سەری شۆڕبووەوە بۆلای سەرم، گومانم برد لە هۆش خۆی چووبێ).

* لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە، عائیشە ئەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ وەفاتیکرد و سەری لەنێوان کۆش و چەناگەم دا بوو، کاتێ گیانی دەرچوو هەرگیز بۆنی خۆشی وام نەکردبوو).

* گیانم فیدای بێ لە سپێدەی ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (١١)ی کۆچی وەفاتی کرد، لەتەمەنی (٦٣) ساڵیدا.

* هەواڵی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بڵاو بووەوە لە مەدینە. هەواڵەکە وەکو بروسکەیەک بوو بۆسەر هاوەڵان لەبەر خۆشەویستی ڕادەبەدەریان بۆی.

* هاوەڵان ئەڕۆشتنە ژوورەوە بۆلای لە ماڵەکەی عائیشە و ئەیانوت چۆن ئەبێ وەفات بکات لە کاتێکدا ئەو شاهێدە بەسەرمانەوە و ئێمەیش شاهێدین بەسەر خەڵکانی ترەوە ؟!

* عومەری کوڕی خەتتاب هات و ڕۆشتە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەرﷺ کاتێ بینی، فەرمووی: (ئەی هاوار بەخۆمان، ئەی دایپۆشن، چەند قورسە داپۆشینی پێغەمبەر).

* پاشان عومەر دەرچوو، شمشێرەکەی ڕاکێشا و هەڕەشەی لە خەڵکی دەکرد و فەرمووی: (والله ببیستم کەسێك ئەڵێ: پێغەمبەری خوا مردووە بەشمشێر لێی ئەدەم).

* هەروەها عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) ئەیفەرموو: ( والله پێغەمبەر ﷺنەمردووە بەڵکو چووە بۆلای خوا، وەکو چۆن موسا ڕۆشت بۆلای خوا، والله پێغەمبەر ﷺ ئەگەڕێتەوە وەکو چۆن موسا گەڕایەوە، ئەوکات دەست و قاچی کەسانێ ئەبڕێ کە ئەیانوت مردووە).

* ئا بەم شێوەیە عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) خۆی پێڕانەئەگیرا لە قورسی مردنی پێغەمبەردا.

* ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) ئامادەنەبوو لەكاتی وەفاتی پێغەمبەردا، پێشتر مۆڵەتی خواستبوو بگەڕێتەوە بۆ سونح .

* یەكێك لە هاوەڵان ڕۆشت بۆلای و هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری پێدا و هەروەها خەڵكی لە حاڵێكن تەنها خوا ئەزانێ چۆنە.

* ئەبوبەكر( ڕەزای خوای لێبێ) كەوتەڕێ بەخێرایی بەسواری ئەسپەكەیەوە هەتا چووە ناو مزگەوتەوە، بینی خەڵكی هەموویان ئەگرین و عومەریش شمشێرەكەی ڕاكێشاوە و قسە بۆخەڵكی ئەكات.

* ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) لای بەلای هیچ لەمانەدا نەكردەوە، ڕۆشتە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگەكەی ڕاكشابوو، پەردەی لەسەر ڕووی شەریفی پاكی لادا.

* ئەبوبەكر (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموی: (إنا لله وإنا إليه راجعون، پاشان كەوتە سەر ڕووخساری شەریفی و ماچیكرد و ئەگریا، فەرموی: بە زیندوێتی و مردن بۆنت هەرخۆشە ئەی پێغەمبەری خوا، والله خوا دوو مردنت لەسەر كۆناكاتەوە، ئەو مردنەی لەسەرت نوسرابوو ئەوە چێشتت، پاشان هیچ مردنێكی ترت تووش نابێت، پاشان ڕووخساری شەریفی داپۆشی).

* ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) دەرچوو بۆلای خەڵکی، بینی هەیانە نکوڵی لێدەکات و هەیانە دۆشداماوە لە قورسی موسیبەتەکە. عومەری بینی هەڕەشە ئەکات لەو کەسەی بڵێ پێغەمبەر ﷺ مردووە.

* ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: (ئەی عومەر لەسەرخۆت. عومەر هەر بەگوێی نەکرد و بێدەنگ نەبوو).

* کاتێ ئەبوبەکر بینی عومەر بێدەنگ نابێ ڕوویکردە خەڵکی و وتاری بۆدان، کاتێ خەڵکی بینیان ئەبوبەکر وتاردەدات ڕۆشتن بۆلای و عومەریان بەجێهێشت.

* ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموی: (ئەی خەڵکینە هەرکەسێ محمدی ئەپەرست ئەوە محمد مرد. بەڵام ئەوەی خوا ئەپەرستێ ئەوە خوا هەر زیندووە و نامرێ).

* پاشان فەرموی خوا ئەفەرموێ: { محمد ﷺ تەنها پێغەمبەرێک نە بووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش وەفاتیان کردووە. ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە لەو دین و ئاینەی کە پێی ڕاگەیاندوون؟!}.

* ئیبنوعەباس ئەفەرموێ: ( واللە وەك ئەوە وابوو خەڵکی نەیانزانیبێ کە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاندبێ تاکو ئەبوبەکر خوێندیەوە).

* گریان و بەرەنیسك هەموو مەدینەی گرتەوە بۆ وەفاتی پێغەمبەرﷺ. موسڵمانان تووشی هیچ بەڵایەك نەبوون وەکو وەفاتی پێغەمبەر ﷺ گەورە بێت.

* کاتێ بەیعەت درا بە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێ) و بوو بەخەلیفە. ئەویش ڕۆژی سێ شەممە بوو. خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ ویستیان بیشۆرن. ڕاجیایی کەوتە نێوانیانەوە.

* وتیان: ( واللە نازانین چی بکەین. ئایا پێغەمبەر ﷺ ڕووت بکەینەوە وەکو هەر جەنازەیەکی تر. یا بەجلەکانیەوە بیشۆرین).

* هەموویان تووشی وەنەوزبوون و خەویان لێکەوت. دەنگێك هات و وتی: پێغەمبەر ﷺ بە جلەکانیەوە بشۆن .

* کاتێ بەخەبەرهاتن ئەو دەنگەی بیستبویان بۆ یەکتریان باس دەکرد. هەستان و پێغەمبەریان بە جلەکانیەوە شۆرد.

* ئەوانەی پێغەمبەریان شۆرد:

١ ـ عەلی (ڕەزای خوای لێبێ ).

٢ ـ عەباسی مامی و کوڕەکانی (ڕەزای خوایان لێبێ).

٣ ـ فەزڵ (ڕەزای خوای لێبێ) .

٤ ـ قوسم (ڕەزای خوای لێبێ).

٥ ـ ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لێبێ).

٦ ـ شوقڕانی بەندەی پێغەمبەر ﷺ.

* عەباس و فەزڵ و قوسم پێغەمبەریان ﷺ ئەمدیوا و دیو ئەکرد. شوقڕان و ئوسامەش ئاویان ئەکرد بەدەستی عەلیدا و عەلیش ئەیشۆرد.

* کاتێ لە شۆردنی بوونەوە. لە (٣) کراسی سپیدا کفنیان کرد و لەسەر جێگاکەی خۆی لە ماڵی عائیشە دایان نا.

* دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ شۆرا و دانرا لەسەر جێگاکەی خۆی لە ماڵی عائیشە، ڕێگە بە خەڵکی درا نوێژی لەسەر بکەن، بەڵام کەس پێشنوێژی نەکات.

* کاتێ نوێژی لەسەرکرا، هاوەڵان ڕاوێژیان دەکرد لەکوێ بینێژن ؟! ڕاجیایی کەوتە نێوانیانەوە.

* هەواڵیان نارد بۆ ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لێبێ)، ئەویش فەرمووی: ( بیستم لە پێغەمبەرەوە ﷺ. فەرمووی: خوا گیانی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە مەگەر لەو شوێنەی پێی خۆشبووە تیایدا بنێژرێ).

* گۆڕی پێغەمبەر ﷺ لێدرا لە ماڵی عائیشە، عەباس وعەلی و فەزڵ ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەوە.

* شوقرانی بەندەی پێغەمبەر ﷺ کراسێکی سوری خستە ناو گۆڕەکەوە، پاشان دایانهێنا بۆناو گۆڕەکەی.

* پێغەمبەر ﷺ لە شەوی چوارشەممە، بەخاك سپێردرا.

* هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێ) زۆر غەمباربوون بۆ کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ، ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ) فەرموی: ( هیچ ڕۆژێکی تاریکتر و ناخۆشترم نەبینی لەو ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ تیایدا وەفاتی کرد).

والحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

## پێڕست



❊❊❊



ئەم نوسینەی بەردەستت وەکو گوزەرێکی خێرایە بەدیار ئەو هەموو وێستگە و ڕووداوانەی ژیانی ئەم زاتە گەورەیە. کە بێخود لەوەسفیدا ئەفەرموێ:

که ڕۆژی هیجری ماتەمە و شەوی ویساڵی شاییە

که سەدهەزاری وەك منی بەگیان و دڵ فیداییە

بەڵێ گوزەرێکی خێرایە هەر لەساتی هاتنە دونیاوە تاکو ساتی وەفاتیﷺ. ئەگینا بەچەندین نوسین و توێژینەوە لەژیانی پڕ بەرەکەتی تێر نابی. وەکو فەنایی لە وەسفیدا ئەفەرموێ:

حوسنی خولق و سیرەتی وەك حوسنی ڕەنگ و سورەتی

شاهێدی دەعوایە ئەرێ گەوهەری یەکتایە ئەو




